سرسیفی، رضا، ۱۳٤۸.
**دیاری**
نووسین، لێکۆڵینەوە و کۆکردنەوەی ڕەزا سەرسێفی.
سقز: گوتار، ۱۳۹۰
ISBN: 978-600-5647-15-0
موضوع: ادبیات عامه کردی
فهرست‌نویسی بر اساس اطلاعات فیپا
٤:۱۳۸۹ س ۷۵ س / PIR ۳۲٥٦    ۲ /۹ فا ۸
کتابخانەی ملی ایران: ۲۱۷۸۰۹۱


ڕەزا سەرسێفی

**دیاری**

ئێدیتۆر: سلێمان عەبدی

دیزانی بەرگ: نیلووفەڕ عەلیموحەممەدی

دیزانی ناوەڕۆک: ئازاد سورخی

چاپی یەکەم: ۱۳۹۰

ئەژمار: ۲۰۰۰ دانە

ناوەندی بڵاوکردنەوەی گوتار

کوردستان، سەقز، شەقامی سەلاحەددین ئەیوبی

تەلەفوون: ۳۲۲۷۰۳۰ ـ ۰۸۷٤

Email: reza_x1348@yahoo.com

# پێرست

**بەشی سێهەم**



**بەشی چوارەم**

## پێشەکی

فۆلکلۆری کوردی، گەنجینەیەکی لە بن نەهاتووە و هەتا لە سەریشی بنووسی، هەر زیاتری دەوێ. بە هۆی ئەوەی لق و بەشەکانی زۆرن، و هەر بەش و لقێکی، چەندین کتێبی گەڕەکە، بە راستی دەریایەکی پڕ لە زێڕ و بایەخدارە، کە مافی هەموو نەتەوەی کوردی بە سەریەوە، هەیە.

لەم کتێبەدا کە ناوی "دیاری" یە، هەوڵی خستنە بەر باس وگێڕانەوەی چوار بەشم هێناوەتە گۆڕێ.

**بەشی یەکەم: نەقڵی کوردی** یە، کە لەم بەشەدا ٥٥ نەقڵی کوردیم، گێڕاوەتەوە.

**بەشی دووهەم: چیرۆکی بەیتی کوردی** یە، کە بەسەرهاتی ئەو بەیتە کوردییانەی کە دەستم کەوتوون، باسم کردووە و لەم بەشەدا هێناومە. دیارە بەیتی کوردی زۆر زیاتر لەو بەیتانەیە، کە من لەو بەشەدا ناوم لێ هێناون.

**سێهەمین بەش، وتەی گەورە پیاوانە**، کە لەم بەشەشدا، بە پێی پیتی کوردی و لە رووی ناوی ئەو بەڕێزانە، وتەیانم گێڕاوەتەوە و لەو بەشەدا هێناومن.

**بەشی چوارەم: گۆرانی کوردییە**، کە هەمووی بابەتی فۆلکلۆرییە.

هیواشم وایە لە پێناو باشترکردنی ناوەڕۆکی کتێبەکە، لە یارمەتی دان و رێنوومایی و هەر چەشنە رەخنە و پێشنیاری خۆتان بێبەشم نەکەن.بۆ پەیوەندی لە گەڵم دەتوانن ئیمیل بنێرن.بەم نیشانەی خوارەوە:

reza_x1348@yahoo.com

## بەشی یەکەم

# نەقڵی کوردی
# (گاڵتە و گەپ)

بەرهەمی هونەرمەندی بەرێز کاک بێهزاد تارا

## پێشەکی بۆ نەقڵی کوردی:

لـە سـەردەمی رابـردوودا، بـە هـۆی نـەبوونی کەرەسـتەی دەنـگ و ڕەنـگ وەک(رادیۆ، تەڵەفزیۆن، کامپیوتەر، سی دی و ...) خەڵکی بۆ رابواردنی کاتێکی خۆش و بۆ نەخشاندنی بزە لە سەر لێوان هەموو کات، نەقڵی خۆش خۆشیان بـۆ یەک گێڕاوەتەوە و کاتیان بەم جۆرە بە سەر بردووە.

هەرچەند گێڕانەوەی نەقڵ و گاڵتە و گەپ، تەنیا تایبەتی میللەتی کورد نیە و لە ناو تەواوی میللەتانی ئەم سەر زەوییە پان و بەرینەدا، هەیە و لە نێو فۆلکلۆری میللەتانی ئەم جیهانەدا تۆمار کـراوە، بەڵـام بـە هـۆی عاتیفـەی زۆری گەڵـانی ڕۆژهەڵـات، بـە تایبـەت میللـەتی کـورد، کـە مـەکۆی ئـەوین و خۆشەویـستی ومیوانداری یە، زۆرتر خەڵکی لە یەک نزیک بوون و کـۆڕی بـزم و میوانـداری و قسەی خۆش، لە ناویاندا زۆرتر بینراوە.

زۆر جار بینراوە کە لە ئاواییەکانی کوردستان، لە لای ئاغای ئاوایی و یـان لـە قاوەخانەکانی ناو کوردەواری(چ لە شارو چ لە لادێ) پیاوێـک بـە نـاوی نـەقاڵ، بەیت وێژ و یان چیرۆک زانیان لا بووە و هەر کات کـەیفیان لـێ بـووە، بانگیـان کردوە و قسەی خۆش و بە تامی بۆ گێڕاونەتەوە. جـاری وا بـووە بـە سـەرهاتی بەیت و چیرۆک چەندین شەوی خایاندوە و ئەو پیاوە، بەوپەری ئیحساسەوە ئەو بە سەرهاتەی گێڕاوەتەوە. جا ئەو بەیت وێژ و یان چـیرۆک خوانانـە، وەسـتایانە

ئەو بابەتانەیان گێڕاوەتەوە. هەر دەڵێی خۆی ئەکتەری ناوی چیرۆکەکە بووە و بە وێنەی شانۆگەرییەک بەسەرهاتی بەیت وچیرۆکەکەی پیشان داوە.

جیا لەوەش ئەو بە سەرهاتە(بەیت وچیرۆک) لە دڵ و مێشکی گوێگران و بینەرانی ئەو بەزمەدا ماوەتەوە و ئەوانیش سینگ بە سینگ و دەم بە دەم بۆ منداڵان و میوانانی خۆیان باس کردووە، هەتا بە ئێمە گەیشتووە.

بە داخەوە هەر ئێستا، بە هۆی زیاد بوونی کەرەستەی بینین و تێکەڵ بوونی خەڵکی لە گەڵ ژیانی شارستانیەت جا چ لە شار و چ لە لادێ، زۆرتری ئەو دابانە لە نێو چوون و یان بە زۆری خەریکە لە نێو دەچن. و هەندێ کەسیش کە ماون، چیرۆک و بەیت و بەسەرهات دەزانن، بە هۆی پێشوازی نەکردنی جەماوەر و خەڵکی، ئەو شتانە لە بیریان دەچێتەوە و لە یاد و بیرەوەری ئەوانیشدا دەسڕێتەوە و ئەمە خەسارێکی زۆر گەورەیە بۆ فۆلکلۆر و ئەدەبی زارەکی کوردی و مەترسییەکی مەزنیشە لە ئاست لە ناوچوونی بەشێکی هەرە زۆری ناسنامەی نەتەوەکەمان.

هەندێک لە نەقڵبێژەکانی ناوداری کورد لە کوردستانی ئێران بریتین لە: فەریق، رەسوول نادری، عەلی خەندان ... .

□

**نەقلی(١):**

دەگێڕنەوە ڕۆژێک کەریم خانی زەند، بە ناو شاری شیرازدا،دەگەڕا و تاقمێکی زۆری لە گەڵ بوو. لەو گەشت و گەڕانەدا، لە جێگایەک تووشی چەند کاریگەریەک بوون کە قوڕەکاریان دەکرد.

یەکێک لەو کاریگەرانە، هەر کە چاوی بە کەریمخان کەوت، دەستی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە و دەستی کرد بە سکاڵاکردن و پارانەوە.

کەریمخان لە دوورەوە چاوی لەو کابرایە بوو. بە لای خۆیەوە وای لێکداوە کە ئەم کاریگەرە دۆعا بۆ عومری ئەو و ماڵ و تەختی ئەو دەکا. بۆ ئەوەی خاترجەم بێ، ڕووی لەو کاریگەرە کرد، وتی: ئەوە چ دۆعا و پارانەوەیە کە لە ناو ئەو قوڕو چلپاوەدا دەیکەی؟

کابرا بە ترسەوە جوابی داوە. وتی: قوربان عەرزی خودام دەکرد کە ئەی خوایە:

ناوت کەریمە و خودای عەرزوئاسمانی. ئەوەش ناوی کەریمە و خاوەنی ئەو هەموو جەلال و شکۆیە، منیش ناوم کەریمە و دەبێ ڕۆژ تا ئێوارە قوڕ بگرمەوە و قوڕ بشێلم. جا چۆن ڕەوا دەبینی ئەو سێ کەریمە ئەوەندە جیاوازییان هەبێ.

کەریمخان قسەکانی کابرای پێ خۆش بوو، ئەمری کرد خەڵاتی کەن.

□

**نەقلی (٢):**

کابرایەک سێ کیژی بوو کاتی شووکردنیان بوو. هەرسێکیان زمانیان پسک بوو و نەیاندەتوانی بە ڕەوانی قسە بکەن. ڕۆژێک خوازبێنیکاریان بۆ هات.

باوکی کیژەکان بۆ ئەوەی خوازبێنیکارەکە نەزانێ، کچەکان پسکن پێی گوتن، هەرسێکیان وەرنە ژوور و لە پاڵی یەکا دانیشن، بەڵام قسە پێکەوە مەکەن. ئەگەر کابراش پرسیارێکی کرد، هەر بە سەر لەقاندن وەڵام بەدەنەوە.

کیژەکان هاتنە ژوور تا بزانن کابرای خوازبێنیکار، کامیانی دەوێ. باوکی کیژەکان لە گەڵ کابرا قسەی دەکرد و ئەوانیش ئەگەر پرسیارێک کرابا، سەریان دەلەقاند.

بەمجۆرە کارەکان دەڕۆیشتە بەرەوە و خوازبێنیکاریش نەیزانی کچەکان پسکن. لەم کاتەدا مشکێک لە تەنیشت کچەکان لە کونێک دەرپەڕی. کچەکان لە ترسان شڵەژان و یەکیان گوتی:

مت!مت!(مشک)(مشک)

دووهەمی گوتی: توا!توا!(کوا؛کوا؟)

سێهەمی گوتی: تووتە تونەکە!تووتە تونەکە!(چووەتە کونەکە!چووەتە کونەکە).

کابرای خۆازبێنیکاریش کە لە هەمو شتێک حاڵی بوو، لە کاتێکدا لە دڵی خۆیدا سپاسی لە مشک دەکرد، ماڵ ئاوایی لێیان خواست و باوک و کچی بەجێ هێشت.

□

**نەقڵی (٣):**

دەگێڕنەوە لە سەردەمی کۆندا، لە گوندێکی کوردستان، دوو گەنج بەناوی ئەحمەدو محەمەد بە شەڕدێن؛ محەمەد بۆ بەردێک دا ئەنێوێتەوە هەلیبگرێ ولە ئەحمەدی بدات. بەردەکە بە هەر هۆیەک بێ، خۆی دێتە دەستی.

محەمەد یەکسەر بیردەکاتەوە، ئەوە دەبێتە هۆیەک بۆ ئەوەی بەردەکە بباتەوە بۆ ماڵەوە و هەڵی بگرێ. دەڵێن چەندین ساڵی پێدەچێ، ئەحمەد و محەمەد بە ساڵ دەکەون و پیر دەبن. ئەحمەد ئارەزوومەند دەبێ بمرێ، بەڵام ئەجەل نەدەهات. دەڵێن ڕۆژێک کابرایەکی بیرمەند لە گەڵیان دەبێت، دەڵێ:برادەرینە سەری بێ ئەجەل، ناچێتە بن گڵ، زۆربەی خەڵکیش دەڵێن: یا ڕەبی دەبێ، ئەجەلی بەچی هاتبێت؟!

لـەم کاتـەدا محەمـەد لـە مەجلیـسەکە دەبێـت، بەسـەرهاتی بەردەکـە دەگێڕێتەوە، کابرای بیرمەند دەڵێ:

دەبرۆ بەردەکە بێنە، محەمەدیش بەردەکە دێنێت و کابرای زانا بەردەکـە لـە محەمەد وەردەگرێ و لە سەر سینگی دادەنێت و ئەحمەد دەمرێ.

□

**نەقلی(٤):**

دەگێڕنەوە گوایە ڕۆژێکیان، نەخۆشێک دەچێتـە لای (ئـیبن سـینا)ی زانـا و حەکیم، بۆ چارەسەرکردنی دەردەکـەی، بەڵـام ئـەو کاتـە هـیچ دەرمـانێکی لا دەست ناکەوێ کە پێی بدات. بۆیە بە ناچاری دەگەڕێتەوە ماڵەوە و بەدەم ئێش و ئازارەوە، جامێک شیر نۆش دەکا.

بەرێکەوت لەو جامـەدا مارێـک مەلـەی کـردووە و نـەختێک لەژەهرەکـەی تێکـەڵ بەشـیرەکە کـردووە، هـەر ئەمـەش دەبێتـە هـۆی چـاک بوونـەوەی نەخۆشەکە.پاشان بۆی دەرکەوتووە کە ئەو شیرەی ئـەم خواردوویـەتی، ژهـری ماری تێکەڵ بووە.

□

**نەقلی (٥):**

کاهینێک تووشی نەخۆشی گرۆ بوون دەبێـت (تێـراوێ) وای لێـدێت هـەموو لەشی دەگرێتەوە، چارەسەری بۆ نادۆزێتەوە و دەست لە خۆی بەردەدا و لە بـەر پیسی وبێزاری خەڵکی، ئەوقاپ و کەلوپەلەی هەیەتی، هەڵیدەگرێ و بەرەو چیا وناو ئەشکەوت دەچێ.

دەزانێ کەوا کۆتایی تەمەنی هاتووە و ئەوەنـدەی نـەماوە، بـا چیتـر خەڵـک بێزی لێ نەکەنەوەو خوا پەرستی لەو شوێنە بکات.

کاتێ لەو ئەشکەوتە خەریکی گیان دەرچوون دەبێ، دەبینێ، ئەو قاپەکۆنـەی کە لە پێشیە، تۆزێ ئاوی تێدا ماوە، مارێک دێت و ئاوەکە هەموو هەڵدەلووشـێ،

پاشان دەڕشێتەوە ناو قاپەکە،کابرا یەکجار تینووی سەرەمەرگ دەبێت. دەڵێ: خۆ من هەردەمرم و هیچ ئومێدێکم نەماوە، ڕەشانەوەی مارەکە دەخواتەوە. پاشان کە دێتەوە سەرخۆ، باشتر دەبێت وبەرە بەرە تفری گرۆوەتی فرێ دەدا و چاک دەبێتەوە.

بۆیە دەڵێن: ژەهری مار هەتا دەتوانرێ وەکو دەرمان بە کار بهێنرێ. بۆیەش وێنەی مار لە جامی لوولدراو کە نیشانەی دەرمانساز ودەرمانخانەیە، بووەتە "ئارم". یان وەک (نیشانەیەک) بۆ دەرمانخانەکان بە کار دێ.

□

**نەقڵی(٦):**

کابرایەک تووشی نەخۆشی گرۆ بوون دەبێت و دەچێتە لای حەکیم.کە تەماشای دەکات، نەخۆشییەکەی تەشەنەی کردووە و بە خزمانی دەڵێت: ئەمە زۆری نەماوە و بیبەنەوە ماڵەوە.

لەرێگادا لە پێش ماڵی، دوکانی(تەرەسازفرۆشی) پشوویەک دەدەن.نەخۆش داوای هەندێ تورشی دەکات. دەچنە لای کابرای خاوەن تورشی. ئەویش دەڵێ: وەختی تورشی بە سەر چووەو ئەوە گەرما داهاتووە، ئێستا کەی وەختی تورشیاتە؟ خاوەن نەخۆش زۆر پێدا دەگرێ، بەڵکو نەختێک ئاوەکەی تورشی مابێ بۆ نەخۆشەکە، وەزعی شڕە.

کابرا دەچێ لە ناو کۆنە گۆزەکان، هەندێ ئاوی رووت کە ماوەتەوە بۆی لەناو جامەکە دەکات و دەچنە ماڵەوە دەیدەنێ. پاش ماوەیەک کابرا نامرێ و بە پێچەوانەی قسەی دوکتور، چاکتر ئەبێت ودێتەوە سەرخۆی و ڕەنگ و رووی جوانتردەبێت، دوایی جامێکی تری بۆ دەێنن و وردە وردە باشتردەبێت. ڕۆژێک دەچنەوە لای دوکتۆرەکە و پیشانی دەدەن. سەری سووڕ دەمێنێ، ئەویش دەڵێ: چیتان داوەتێ؟

بـۆی دەگێڕنــەوە کـە لــە ئـاوی تورشــی رووت زیــاتر، هیچــی تــری نەخواردووە،دوکتورەکـە بـاوەڕ ناکـا، خـۆی دەچێتـە تەماشـاکردنی ئـەو کوپـە تورشیانە کە ئاوی تێدا ماوە. لە بنەبانی خانوودا، هەندێ لەو ئاوە دەردەهێنـێ و بە ئەسکولە ناو کوپە لێک دەکا. هەندێ چەورایی بە سەرئاوەکە کـەوتووە. بـۆی دەردەکەوێ کە ئەوە ژەهری مارە. و دەزانێ ژهری مار دەرمانە.

□

**نەقلی (٧):**

ڕۆژێ پاشای شار (لوقمانی حـەکیم)ی بانـگ کـرد کـاوڕێکی پـێ دا و وتی: سەری ببڕە وخراپترین شتێک لە لەشی دا چییە، بووم بێنە. ئەویش کاوڕەکـەی سەربڕی ودڵ و زمانی دەرهێنا وبردی بۆ پاشا.

پاشا وتی: زۆر باشە و کاوڕێکی‌تری دایێ و وتی: ئەمەش سەر ببڕە و باشترین شتێک کە لە لەشی دایە، بۆم بهێنە.

لوقمانی حەکیم ئەویشی سەربڕی ودیسان دڵ وزمـانی دەرهێنـاو بـردی بـۆ پاشا.

پاشا سەری سووڕ ما، وتی: پێم وتی، خراپترین شتی لەشی ئـەو کـاوڕەم بـۆ بهێنە، هەر دڵ و زمانت بۆم هێنا. وتم چاکترین شت لە لەشیدا بۆم بهێنە، هـەر دڵ و زمانت بۆم هێنا.

لوقمانی حەکیم لە وەڵامدا وتی: دڵ وزبان خراپترین و باشترین بەشی لەشن ئەگەر جوان و بە جێ بسووڕێ.

□

لوقمانی حەکیم بەکوڕەکەی دەڵێ ئەم وەسیەتانە لە یاد نەکەی:

١-ئەگەر لە نێوان خەڵکیدا بووی، زمانت بپارێزە.

٢-ئەگەر لە ناخۆشیدا بووی، رەوشتت بپارێزە.

٣-ئەگەر لە ماڵی یەکێکی تر بووی، چاوت بپارێزە.

٤-دوو شت هەرگێز لەبیرمەکە: یەزدان ـ مردن.

٥-دوو شتت لە بیر بێ، چاکەت لە ئاستی یەکێکی تر، خراپەی یەکێکی تر لەئاستی تۆ.

□

**نەقڵی (٨):**

کابرایەک لە پرسە و سەرەخۆشییەک، لە مزگەوت ،لە لای کابرایەکی دیکەوە پێکەوە دانیشتبوون و قسەیان دەکرد.یەکیان قسەی بۆ ئەوی دیکە دەگێڕایەوە.وتی من دەچوومە قاچاخچیەتی،هێسرێکم پێ بوو لەکێوێک چوومە سەر، لە پڕا هێستێرسمی خزاو خەریک بوو بکەوێ. خێرا ئاوا لەغاوەکەیم گرت ونەمهێشت دەرچێ.

(ریشی کابرای پەنای گرتبوو) ئەو کابرایش ئەوەندە پێکەنی، مەجلسی پرسە بوو بە پرمە و هۆڕێ،هەر مەپرسە.

□

**نەقڵی (٩):**

مێرد:بێ تۆ دونیا تاریک و ڕەشە، وڵات تەپ و تۆزە، ئاسمان بە تەمە، هەتاو لە پشتی هەور خۆی حەشارداوە وچاوەکانم پڕ گریانە، بەڵام لەگەڵ تۆدا هەوا ساف و ڕەوان، ئاسمان گەش و هەتاو و پڕشنگدارە و...

ژن: بەسە، بەسە ئیتر، ئەوە ئەوانە لە ئیدارەی هەواناسی فێربووی.

□

**نەقڵی (١٠):**

ڕۆژێک درۆزنێک بە سەر هاتی دوو کەڵی خۆیانی دەگێڕاوە و گوتی: دوو کەڵمان بوو، ڕۆژێک بەرەنگاری یەکتر بوون. شەڕەکەیان گەیشتە ناو گەنمەکەمان ولێمان ون بوون. هەر چەن لێیان گەڕاین نەماندینەوە. گەنمەکانمان دروێنە کرد، دیار نەبوون،گێرەمان کرد هەر دیار نەبوون، کردمانە

ئارد هەر بێ سەر و شوێن بوون. تا ئەوەی، ڕۆژێک دایکم خەریکی نان کردن بوو، لە ناکاو دیتی کولێرەیەک هەڵماساوە. دایکم پۆرگەکەی تەقاندەوە و دیتی، ئەو دوو کەڵە هێشتاش هەر خەریکی شەڕن.

□

**نەقلی (١١):**

دەڵێن جارێک پیاوێک لەژێردارگوێزێک دانیشتبوو، کە سەیری کرد بنە شووتییەک لە نزیک پیاوەکە بوو. شووتییەکی گەورەی پێوە بوو، بیری کردوە وتی: بەخوا سەیرە، خودا هێندە ئیشان دەکات سەرسوور هێنەر!

ئەو بنەشووتییە هێندە بچووکە ئەو زڕە شوتییەی پێوەیە وئەم دارگوێزە گەورە، ئەوگوێزە بچووکانەی پێوەیە. دەبوایە شووتی بەدار گوێزۆ بوایە،گوێزەیش بە بنە شوەتیوە با......!

لەم کاتەدا بایەکی توند هەڵیکرد وگوێزێک لەدارە گوێزەکە کەوتە خوارەوەو بە سەر کاربرادا کەوت!

کابرا گوتی: خودایە لێم ببوورە من نەمزانی هەڵەم کرد، ئەگەر ئەو گوێزەی لە دار بەربووەوە، شووتی بوایە، من چیم بە سەر دەهات!خودایە تو ئیشی خۆت باشتردەزانی، بۆ ئێمە نیە تێکەڵ ئیشی تۆ بین.

□

**نەقلی (١٢):**

دەڵێن: ڕێوییەک بە قەل ومریشکی، ئاواییەک فێردەبێ، قڕانیان تێ دەخا، خۆی لێ مات دەکەن، دەیگرن، دەڵێن: چۆنی لێ کەین کە تۆڵەی ئەو هەموو قەل ومریشکەی، لێ کەینەوە. یەک دەڵێ:ددانی بکێشین،یەک دەڵێ: لاقی دەرپەڕێنین، یەک دەڵێ: زیندانی کەین تا دەمرێ،یەک دەڵێ: بە زیندوویی کەوڵی کەین.

کوێخادەڵێ: مریشکی مەلاشی زۆر خـواردووە، دەیبەینـە لای مـەلا بـزانین دەڵێ چی؟ مەلاش کە لە مەسەلەکە دەگا، مەندیلەکەی لە سەر خۆی دەکاتەوە و لـە سـەر ڕێـوی دادەنـێ و دەڵـێ: ئـەم جـارە بەڕەڵـای کـەن، خەڵـک بـە سەرسووڕمانەوە دەڵێن: مامۆستا مەعنای ئەم کارە چییە؟

دەڵێ: کاکە بەو مەندیلەوە ڕێوی لە ڕووی هەڵنایە دزی بکات، کەسیش چی ناداتێ، ناچارلە برسان دەمرێ.

□

**نەقلی(١٣):**

دەگێڕنەوە لەگوندێکی کوردستاندا، فـەقێی مزگـەوت، شـەوێکی زسـتان بـۆ دیاری کردنی ئەو کەسەی لە هەموویان ئازاترە، مەرجێک دادەنێن.دەڵـێن ئـازا ئـەو کەسـەیە کـە بتوانـێ بـە شـەوی تاریـک دەسـرۆکەیەک ببـا و لـە نێـو قەبرستانەکەدا بە بزمار دایکوتێ و بگەڕێتەوە. دوای گەڕانەوەی ئەوا هاواڵـەکانی وێکرا بچن سەری بدەن.

فەقێیەک دەڕوا، زۆری پێ دەچـێ، ناگەڕێتـەوە.کاتێـک هاواڵـەکانی دەڕۆن دەبیـنن لـە گـەڵ دەسـرۆکە دیـاری کراوەکـەدا، گۆشـەیەکی کـەوا کەشـی داکوتاوە.کاتێک ویـستوویەتی هەڵـسێ و بـۆ مزگـەوت بگەڕێتـەوە، وا دەزانـێ، یەکێک لە دواوە گرتوویەتی.لەوێدا لە هۆش دەچێ.هاواڵەکانی فریای دەکـەون، بەڵامگۆج وئیفلیج دەبێ و تەنیا لە مردن ڕزگاری دێ.

□

**نەقلی(١٤):**

کوردێـک، عـەرەبێک، هێندییـەک و ئێنگلیزییـەک، سـواری فرۆکـە دەبـن. فرۆکەکە باری زۆر قورس دەبێ، فڕۆکەوان گوتی: پێویستە یەکێ لە ئێوە خۆتان فیدا کەن. ئێنگلیزییەکە خۆی فڕێداوگوتی: لە پێناو ئێنگلیزدا.

هێندییەکە خۆی فڕێدا وگوتی:لە پێناو هێندوستاندا.

کورد و عەرەبەکە مانەوە.

کوردەکە پێلی عەرەبەکەی گرت ولە ناو فڕۆکەدا هاویشتییە خوارەوە. هۆی ئە وکارەیان لێ پرسی، گوتی: بۆ ئەم مەبەستە کورد و عەڕەب فەرقی نیە.

□

**نەقلی(١٥):**

جارێک کابرایەک دەچێ بۆ مێوانخانەیەک. لەوێدا پۆلیسێکی لە گەڵ دەبێ.بەخاوەن مێوانخانەکە دەڵێ:

بەیانی زۆر زوو هەڵمسێنە کارم هەیە. ئەویش بەیانی زوو هەڵیدەستێنێ. کابراش ئەوەندە بە پەلە دەبێ، لە جیاتی جل وبەرگی خۆی،جل وبەرگی پۆلیسەکە لە بەر دەکا و دەڕوا.

لە ڕێگا سەیری خۆی دەکا، خۆی نیە. ڕادەوەستێ و دەڵێ:

بەخوا کابرایەکی کەرە لە جیاتی ئەوەی من هەڵسێنێ، چووە پۆلیسەکەی هەڵساندووە.

□

**نەقلی(١٦):**

زانایەک بەشوانێکی گوت:

بۆ لە جیاتی شوانی وەدوای زانست ناکەوی؟

شوان گوتی:کورتە زانستەکان هەموویان دەزانم و فێریان بووم.

زاناگوتی: هەرچی فێری بووی بیگێڕەوە. شوان گوتی: کورتە زانستەکان پێنج شتن:

١-تا ڕاستی بێ، درۆ ناکەم.

٢-تا حەڵاڵ بێ، حەڕام ناخۆم.

٣-تا خۆم عەیبم هەبێ، لەعەیبی خەڵکی ناکۆڵمەوە.

٤-تا خودا ڕزقم بدا، ناچمە بەر دەرگای هیچ کەس.

٥-تا نەچمە بەهەشت لە فڕوفێلی شەیتان غافڵ نابم.

زانا گوتی: ئەلحەق تەواوی زانست فێربووی و هەرکەسیش ئەو پێنج ئاکارەی ببێ، نیازی بەکتێبی زانست نیە.

□

**نەقڵی(١٧):**

دووکەس نزیک بە ١٠ساڵ بوو چەلەمەشکێنەیان کردبوو، بەڵام هیچ کامیان نەیانتوانیبوو بیبەنەوە. هەتا ڕۆژێک باوکی یەکیان دەمرێ و لە سەرگۆڕەکەی، هێندە لە خۆی دەدا وباوکەڕۆ دەکا، پێچ وکڵاوەکەی لە سەردەکەوێتە خوار.

دۆستەکەی کە لەو کۆبوونەوەیەدا بەشدار بوو، بە دەرفەتی زانیو، خێرا و بە پەلە پێچەکەی هەڵ گرتەوە و بە کابرای گوت:

هەمووبان دەمرین،خودا عافووی کا، زۆری خۆ بۆ ناڕەحەت مەکە.لە پاشان کڵاوەکەی دایە دەستی.کابراش گوتی:ئەی وای...لەبیرمە باوکەڕۆ......باوکەڕۆ! لە بیرمە......لە بیرمە.

□

**نەقڵی(١٨):**

لەمەجلیسێک یەکێ، لەگەورە پیاوان، زۆر بە وشیاری و هۆشی کوڕەکەی دەنازێ وتاریفی لێی دەکرد.

ئەوانی تریش لەکوڕەکانی خۆیان تاریفیان دەکرد. وتیان: ئێمە بین ئەم مەبەستە تاقی کەینەوە، تا بزانین کامیان زیرەکن.

یەکێک وتی: کوڕەکەی من، کوڕی تۆ ئەوات بۆ چەم و بە تینویەتی دەیگەڕێنێتەوە.

سەرئەنجام دوو کەس لەکوڕەکانی ئەو کوڕە چوون.لەوێ، یەکێک لە کوڕەکان وتی: ئەگەر مەردی لەو ئاوە بخۆ. ئەوی تر وتی: ئەمن دەخۆم و لە

کەسیش ناترسم. وتی: باشتروایە بچین شایەدێک بینین تا بزانن تۆ لەو ئاوەت خواردوەتەوە.

هەر دووکیان چوونە نێو کۆڕەکە، لای باوکیان، ولە ناومجلیسەکەدا رووداوەکەیان بۆیان گێڕایەوە.

هەموو بەو کارە پێکەنینیان هات و زانیان کامیان وشیارترن.

□

**نەقلی(١٩):**

پیاوێک بە سواری کەر بە نێوەراستی خیاباندا دەڕوا. پۆلیس دەیگرێ ودەڵێ: جەریمە بدە! نازانی ئەو کارە خیلافە؟

سەت وپەنجا تمەن بدە!

بۆ سەت و پەنجا؟ سەدی بۆ خۆت وپەنجای بۆ کەرەکەت؟

قوربان ئەبێ، خۆیشم وەک کەرەکە حیساب بکەی و پەنجاش لە من بستێنی.

□

**نەقلی(٢٠):**

ڕۆژێک قانع بەکوڕەکەی (کوتەک) دەڵێ: ژنت بۆ دێنم. کوتەک ئەڵێ: بابە ژن ناهێنم!

قانع ئەڵێ: ڕۆڵە، هەرلە سەرپشتی بێشکە بۆم مارە کردوویت. کچی خزمێکی خۆمانە. ئەبێ بۆت بگۆزمەوە.

کوتەک بەم شێعرانەی خوارەوە وەڵامی باوکی ئەداتەوە و ئەڵێ:

باوکم ودایکم کە کەوتنە کایە منیان خستە ناو دونیای بێ مایە

بۆ شەڕەشەق و جەفای ڕۆژگار بۆ دەردی سەری و ڕەنجی بێ شومار

شەرتە من هەرگیز نەکەومە کایە کەس نە خەمە ناو دونیای بێ مایە

گەر منال بۆ نان نەگرێ بامانت بابە تۆ چۆن وا ئەگا بەگیانت؟

ئەگەرتۆ باوكی خۆشت نەناسی　　من تۆم چاك دیوە زۆر بە كەساسی

□

**نەقلی(٢١):**

دوو منداڵی هاوتەمەن و دراوسێ، دەمە تەقەیان لێ پەیدا بوو.بابی منداڵەكان هەریەك لەسەر منداڵی خۆیان هاتنە جواب.بابی یەكیان گوتی: دەبێ بچینە لای قازی تا بزانین تاوانبار كێیە؟

هەر دووكیان منداڵەكەی خۆی لەكۆڵ كرد و بۆ لای ماڵی قازی كەوتنەرێ. یەكێك لەمنداڵەكان بەوی تری گوت: كەری من چاترە یا هی تۆ؟

□

**نەقلی(٢٢):**

حافزێك بە دووچاو ساخەوە لە ناو شاردا دەگەڕان.لێیان پرسی: مامۆستا، ئەوەیان چاو ساخە، ئەدی ئەویدی چكارەیە؟

حافزگوتی: ئەوەچاوساغە، ئەوی تریان تەرحی كادە.

□

**نەقلی(٢٣):**

باب چاو لە كارنامەی كچەكەی دەكا و دەڵێ: جوغرافیا یەك، فیزیك سفر، شیمی سفر، تاریخ سفر، ریازی سفر. ئەوە بۆ چوار سفرت هەیە؟

كچ: بابەگیان، جوغرافیام لەهەموویان زۆرتر خوێندبوو.

□

**نەقلی(٢٤):**

رێبوارێك چاوی بەپیاوێكی كوێر كەوت، ویستی تمەنێكی لە دەستی باوێ. بەڵام تمەنەكە كەوتە خوار،كوێرەكە خۆی داهێناوە هەڵیگرێتەوە.رێبوارگوتی: ئەدی ئەتۆ كوێر نی.

کوێرەکە: نەخێرکوێرنیم، لە جێگای دۆستە کوێرەکەم راوەستام کە چووەتـە سینەما.

□

**نەقلی(٢٥):**

سێ دۆست کە یـەکیان کوێردەبـێ، یـەکیان شـەل وئـەوی تریـان فـەقیر، لەسەرچۆمێک دانیشتبوون.

ئەوەی کوێربوو، ئاوخۆرییەک پڕ لە ئاو دەکا و لە پـێش چـاوی دادەگـرێ و دەڵێ: بە،بە،لەوشەربەتە سوورە.

شەلەگوتی: هەستم بەشەپان تێت هەڵدەم؟

فەقیرکە گوتی: بیکووژە خوێنەکەی ئەمن دەیدەم.

□

**نەقلی(٢٦):**

جارێک منداڵە کوردێک، ڕۆژێکی ساردی پـایز لـە مـاڵ چـووە دەرەوە و لـە دەشتی بەرماڵەکەیانا، بەچکە مارێکی بەرچاوکەوت کە سـەرما سـڕی کردبـوو و نەیئـەتوانی ببزوێتــەوە، ئـەمیش بەلایــەوە جـوان بـوو، و زۆریــش بـەزەیی پیـا هاتەوە.لێی نەوی هەڵیگرت و هێنایەوە بۆ ماڵەوە. خستیە کۆشیەوە، و لـەگۆیی ئاگردانەکە داینا.

زۆری پێ نـەچو، توولـە مارەکـە بـەتینی ئاگرەکـە گـەرمی بـووە و کەوتـە جمووجـۆڵ. بـاوکی راسـت بـووەوە و بەکوڕەکـەی وت: ڕۆلـە چاکـە لـە گـەڵ نائەهلا مەکە، پەشیمان ئەبیتەوە.

ڕۆلە!چاکەکردن لەگەڵ پیاوی خراپا، وەکو خراپەکردن وایـە، لەگـەڵ پیـاوی چاکا.

□

**نەقڵی(۲۷):**

کابرایەک سواری وشتر دەبێ و قاوت دەخوا،بایەکی توندیشی دێ. رێبوارێک بە تەنیشتی دا تێدەپەڕێ و لێی دەپرسێ: قوربان ئەوە چ دەخۆی؟وشتر سوار جواب دەداتەوە:هەتا ئەوبایە لەوکونەوە بێ هیچ.

□

**نەقڵی(۲۸):**

دەگێڕنەوە لەسوڵتان مەحموودی غەزنەوی،شەیتان وشۆفارچوونە بن هەنگڵی وپێیان گوت: هەیاس بەتۆ خائینە،هەموو ڕۆژێ هۆدەیەکی هەیە، کلیلەکەی بەخۆیەتی، لەخەزێنەی شا دەدزێ ولەوێ قایمی دەکا.

سوڵتان مەحموود فەرمانی دا هەیاسیان لە بەندیخانە کرد، پاشان بۆ خۆی وچەند وەزیر و وەکیل دەرکی هۆدەکەی هەیاسیان شکاند. وچوونە ژوورێ، جگە لە دەستێک بەرگی شوانی چی تێدا نەبوو، هەموو سەریان سوورِما، سوڵتان رووی لە وەزیر و وەکیلان کرد، کەس بەو سرەی نەزانی.

سوڵتان ناردیە شوێن هەیاس ......

هەیاس گوتی: هەتا سوڵتان بۆ خۆی نەیەتە لام، نایەمەدەر، سوڵتان لەدووی چوو. بە ڕازو گلەیی هێنایە کن جل وبەرگی شوانی و گوتی: هەیاس! هەموو شتێکم بۆ روونە ئەو بەرگ و لیباسە نەبێ، بڵێ بزانم، ئەوانە چن؟ پێم بڵێ بۆ چی ڕۆژێ جارێک سەر لەو کۆنە لیباسانە دەدەی.

هەیاس گوتی: قوربان ئەگەر لەبیرت بێ، وەختێک ئەمن هاتمە خزمەتت ئەو بەرگانەم لەبەردا بوو، بۆیە ڕۆژێ جارێک سەریان لێدەدەم هەتا خۆم لێ نەگۆڕێ. بۆیە رام گرتوون ئەسڵی خۆم لە بیر نەچێتەوە.

□

**نەقلی(٢٩):**

تـەیمووری لـەنگ لەمـەلا دەپرسـێ: خەلیفـەکانی عەبباسـی هـەر کـام لەقەبێکیان هەبوو، وەک مووفەق بیللا، متەوەکەل بیللاو موعتەسەم بیللا.

ئەگەر من یەکێک لەوان بام، کامیانم هەڵبژاردبایە باشتر بوو؟

مەلا لە وەڵامدا گوتی: قوربان نەعوزوبیللا.

□

**نەقلی(٣٠):**

کەڵەشـیرێک بـە رێگـادا دەڕۆیـشت و رێوییـەکی تـووش هـات، رێـوی بـە کەڵەشێری گوت: لەگەڵ کێ دەڕۆی؟

کەڵەشێرگوتی: لەگەڵ کاکم.

گوتی: دەکرێ، کاکتم نیشان بدەی؟

کەڵەشێرگوتی: بۆ ناکرێ.

کەڵەشیر وەپێش مام رێوی کەوت و رێوی بردە سەر تاژییەک.

رێوی کە چاوی بە تاژی کەوت: دەرپەڕی وگوتی: دەک نەعلـەت لـەخۆت و کاکت.

□

**نەقلی(٣١):**

دوو مێروولە بە سەر سەری کابرایەکی کەچەڵ دا دەڕۆیشتن: یەکیان بـەوی دیکەی گوت: کاکە تینومە.

مێروولەی گەورە لە وەڵامدا گوتی: بڕێکی دیکـە ددان بـە جـەرگت دابگـرە، ئاخر نازانی لەو بیابانە وشکەدا ئاو وەگیر ناکەوێ.

□

**نەقلی(٣٢):**

"مەولەوی" بویژێکی هونەرمەندی گەورەی کورد بوو. ڕۆژێکیان لەشاری سنە لە کۆڕێکدا دەبێ. لێی دەپرسن دەڵێن:

تو هەر دەڵێی هۆزەکەم خۆشیان دەوێم و بە گەورەم دەزانن، چۆنی نیشان دەدەی کە ڕاست دەکەی؟

(مەولەوی)یش لە وەڵامدا دەڵێ: خۆ ئەگەر هیچ نەگێڕنەوە، ئەوە بۆ من بەسە، کەهەورامی یەک بارێکی گران لە کەرەکەی دەنێ و ڕێ دەکەوێتە (ملەی ئەوێ هەنگ) و دەیەوێ بەوێدا کەرەکەی سەربخا، کە کەرەکەی نەدەتوانێ بڕوا، پێی دەڵێ: هەچە دەی! بە خودا ئەگەر وەک (مەولەوی)یش بی، هەر سەرت دەخەم.

□

**نەقلی(٣٣):**

ڕۆژێک مەولەوی ڕێی دەکەوێتە پاوە، دەبێتە میوانی مەلایەکی پاوەیی.مەولەوی سێ ڕۆژ لای مەلاکەی خانە خوێ دەمێنێتەوە،کەچی خاوەن ماڵەکە هەر(توور)و(دۆ)ی دەرخوارد دەدا!

ئەویش خۆی ئامادە دەکا بگەڕێتەوە. مەلاکە پێی دەڵێ: مامۆستا! زۆر زوو ئۆغرت کرد.مەرێکم دانابوو بۆت سەر ببڕم.مەولەویش ناکاتە نامەردی، دەڵێ: کە واتە سوێندم وابێ، تا لێی نەخۆم ناڕۆمەوە.....!

کە مەولەوی ئەوەی دا بەگوێی خانەخوێ کەیدا بە تاسەوە، دەچێ!

□

**نەقلی(٣٤):**

کۆستە لە ناو کوردەواریدا سەیرو ناوازەن.ئەحە کۆستەی خورماڵیش لەهەموان سەیرتر بوو.ئەوەندە زرنگ بوو، گرینگ بوو. ئەحە کۆسە پیاوێکی پەسەند بوو. لە گرانجانیدا نەهەنگ بوو. لەگەڵ کڕیارەکانیدا بەجەنگ

بــوو.تاحــەزیش بکــەی بــەچنگ بــوو. تەنانــەت ئێــرانی یــەکانیش لەدەســت (ئەحەکۆستە)ڕزگار نەبوون.

دەگێڕنەوە: کە ئەحە کۆستە لـە تـافی لاویـدا دەچێتـە شـاری هەمـەدان و تفەنگ و فیشەکێکی زۆر دەکڕێ، بەڵام چۆن دەربازیان بکا؟! ڕەنگە چەتە ودز و درۆزن پێی بگەن و رووتی بکەنەوە....

کە واتە دەبێ چی بکا تا خۆی لەم تەنگ وچەڵـەمەیە رزگاربکـا؟.....دێنـێ، تفەنگ وفیشەکەکان لەشتێکەوە دەپێچێ و دەیانخاتە شێوەی پیاوێکی مـردوو، وە پاشان دەیانخاتە سەردارە تەرمێک؟.........

چەند کەسێکی ئەو ناوەیش دەدۆزێتەوە و بەکرێیان دەگرێ. و فێریان دەکـا کەئەم دارە تەرمە بە مردووەکـەوە (کەتفـەنگ و فیـشەکەکانە) بەسـەر شـانەوە هەڵبگرن و، هەندێکیش باوەکەڕۆ و براڕۆ بکەن تا لە سنووری ئێران تێپـەردەبن ودەگەنەوە خورماڵ.

بــــەم چەشــــنە ئەحــــە کۆســــتە ئــــەو هــــەموو تفــــەنگ وفیــــشەکانە،بێ گیروگرفت،بەئاسانی دەرباز دەکا و رزگاریش دەبێ لەدزو درۆزن.

□

**نەقلی(٣٥):**

بەگێک بۆ سەرکێشی، جارێک دەچێ بۆ مەزرا و لە ڕێگـا تووشـی کابرایـەک دەبێ، لێی دەپرسێ، کوڕە نێوت چییە؟

کابرا دەڵێ: قوربان نێوم، مەنسوری ئیـبنی مووسـایە (منـصور ابـن موسـی) کابرای بەگ بە عادەتی بەگی، لێی توڕە دەبێ و پێی دەڵێ:کوڕە واوا پێکراو، ئەو نێوە درێژە چییە. دەڵێی گوریسە!

بە سەری بـابم تـا لـەو سـەرەوە دەگەڕێمـەوە نێوەکـەت کـورت نەکـەیوە، توخماخی سەرت دەکەم. کابرای بەگ ئەوە دەڵێ و ڕکێف لە بارگینەکەی دەدا وەڕوا.

کابرای بێچارەش لەترسی هەڕەشەی بەگ نازانێ چ بکا، هەرچی بیردەکاتەوە نازانێ چۆن نێوەکەی کورت کاتەوە، تا لە دەستی بەگ رزگاری بێ، زۆر بیری کردەوە تا لە ئاکامدا بیرێک بە مێشکی داهات و بەم جۆرە دەستی کرد بەکورت کردنەوەی نێوەکەی.

گوتی:مەن، زۆرە دەی کەم بە ڕتیڵ (نزیکەی دووکیلو) سوور (بە شەیپوری گەورە دەڵێن) ئەویش دەکەم بە بۆق، ئیبنیش واچاکە بکەم بەکوڕ.موو دەکەم بە پەشم، سی(٣٠)زۆرە، دەی کەم بەپازدە. کابرا لەترسا سەرو چاوی نێوەکەی تێکردەوە وچاوەڕوان بوو کە کابرای بەگ بگەڕێتەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو، بەگ گەڕاوە و لەکابرا خوڕی، کوڕە نێوت چییە؟

کابراش گوتی: قوربان، ڕیتڵە بۆقی کوڕی پەشمی پازدە.

□

**نەقلی(٣٦):**

کابرایەک هەبوو"مام عەوڵا"ی ناو بوو ، هەرچەند لێیان دەپرسی، مام عەوڵا عومرت چەندە؟دەیگوت: پێنجا و پێنج ساڵ.

وا ڕێکەوت کە پاش دە پانزدە ساڵ دواتر لێیان پرسی یەوە، مام عەوڵا عومرت چەندە؟ هەرگوتی: پەنجا و پێنج ساڵ.

گوتیان: ئاخر چۆن دەبێ دە پانزدە ساڵ لەمەوبەر پەنجا و پێنج ساڵ بی و ئێستاش هەر پەنجا و پێنج ساڵ؟

ئەویش گوتی: برام، پیاو دەبێ لە سەر قسەی خۆی بێ، نابێ هەر ڕۆژێ قسەیەک بکا.

□

**نەقلی(٣٧):**

پیاوێکی لادێیی کوڕەکەی خۆی نارده شار بۆ دەرس خوێندن، دوای چەند ساڵێک گەڕایەوە بۆ لادێ. تاقییان کردەوە تا بزانن هیچ فێر بووە.

باوکی وتی: ئەم ماوەیە چیت ئەکرد؟

کوڕەکە: ڕۆژێک من نەخۆش بووم و ڕۆژێک مامۆستا کەم. ڕۆژێک من ئەچووم بۆ حەمام، ڕۆژێک مامۆستاکەم. ڕۆژێک من جل و بەرگم ئەشۆرد، ڕۆژێک مامۆستاکەم و ڕۆژی حەوتەمیش هەینی بوو.

□

**نەقڵی(٣٨):**

لاوێک دەچێتە لای قەساوێک، کە کچی لێ بخوازێ. دوای سڵاو و ماندو نەبوونی دەڵێ: پێم خۆشە بە نۆکەری خۆتم قەبووڵ کەی و کچەکەتم بدەیتێ، کابرای قەساو کە زۆر سەری قاڵ دەبێ بە دەم گۆشت لەت کردنەوە دەڵێ: بە ئیسقانەوە بێ یا بێ ئێسقان.

**نەقڵی(٣٩):**

بەهلوول کەوشی تازە لە پێ دەکا و بۆ نوێژ خوێندن دەچێتە مزگەوت. دەبینێ کە پیاوێک چاو لە کەوشەکانی دەکا، دەزانێ کە تەماحی لە کەوشەکانی کردووە، ناعیلاج دەبێ بە کەوشەوە نوێژ بکا.

پیاوێک دەڵێ: نوێژ خوێندن بە کەوشەوە نابێ.

بەهلوول دەڵێ: ئەگەر نوێژیش نەبێ، خۆ کەوشەکان دەبن.

□

**نەقڵی(٤٠):**

فایق بێکەس شاعیری ناوداری کورد، بۆ لە بیرچوونەوەی دەردی هەژاری و فەقیری زۆر جار دەستی بۆ خواردنەوەی مەی بردوە و لە کاتی نەشئەو خۆماریدا شێعری گوتووە. جارێک لە ماڵی دۆستێکی لە کاتی خوماریدا ئەم شێعرەی وتووە:

ئەی مانگ من و تو هەر دوو هاو دەردین

هەر دوو گرفتار یەک ئاهی سەردین

لەم کاتە خانەخوێیەکە دەینووسێتەوە و سبەی بۆی دەخوێنێتەوە ... بێکەس دەست بە گریان دەکا و دەڵێت: دەبێ چەند قەسیدەی وام لە کیس چوو بێت.

□

**نەقلی(٤١):**

**مامۆستا هەژار دەیگێڕێتەوە و دەڵێ:**

پاشایەک هەبووە لە وڵاتەکەیدا جاڕی دەدا ئەوەی خۆی بە هونەرمەند دەزانێ و دەتوانێت هونەر بنوێنێت با بێت بۆ دەربار تا خەڵاتی بکەم.

ئیتر ئەوانەی هونەریان لە خۆدا دەدی، ڕێگەی دەرباریان گرتە بەر و هەر یەکە هونەری خۆی نواند... کابرایەک بە هەزار زەحمەت و سیرم سیرم خۆی گەیاندە دەربار و خزمەتی شا.

شا فەرمووی: ئادەی بزانم چیت پێیە بۆ وتن و یا کردن...!

کابرا قوتوویەکی بچووکی دەرهێنا کە پڕی بوو لە دەرزی درووومان. بە هێمنی توانی سەد دەرزی بە سەر یەکەوە وەک گوڵتە دانێ. شا کە ورد بوویەوە ڕۆانی ئەو دەرزیانە بە سەر یەکەوە، نووکی ئەو بە سەر ئەوی تردا چوونە بە ئاسمانا، هەر وا سەری سووڕما، فەرمانی دا سەد لیرەی زێڕی بدەنێ و سەد شەقیشی تێ هەڵدەن. سەد لیرەیان دایە و کابرایان پاڵ خست بۆ تێ هەڵدان.

کابرا هەڵگەڕایەوە و وتی: قوربان سەد لیرەکە باشە، ئاشکرایە ... بەس سەد شەقەکە هی چییە؟

شا لە وەڵامدا وتی: سەد دەرزی بە سەر یەکەوە، کەڵەک کردن بەراستی هونەرە و لە هەموو کەس نایەت، بەڵام ئاخر.....ئەم هەموو کات و هونەرت بە چییەوە سەرف کردوە، وا کردتە دووسەدیش بە کەڵکی چی دێت.... کە واتە شایانی ئەو سەد شەقەی. بڕۆن تێی هەڵدن.

□

**نەقلی(٤٢):**

**شێعری عەبدوڵلا میرزا ئەحمەد پێنجوینی:**

| | |
|---|---|
| کچێکم هەبوو خاڵ لە رو بێ خاڵ | خاڵی کۆچی کرد سا بە هەر ئەحواڵ |
| کچ کە تەمەنی گەیشتە یەک ساڵە | ئەگریا و ئەی وت ئەڕۆم لەم ماڵە |
| سەیربوو دوای شەو، بەیانی هەستیاین | بێ خاڵیان بانگ کرد تیا نەبوو گیان |
| کۆچی کرد ئەویش چوو بۆ لای خاڵی | زۆر بە داخەوەم لێی نەبووم حاڵی |

□

**نەقلی(٤٣):**

لە بۆکان کابرایەک دەبێ حاجی میرزا خانی پێ دەڵێن. ڕۆژێک یەکێک لە دانیشتووانی ئاوایی، گاڵتەی لە گەڵ دەکا و دەڵێ:

چۆن چوویە حەج بووی بە حاجی، چۆن دەرست خوێندووە و سەوادت هەیە، پێت دەڵێن میرزا، چۆن زۆرت سەروەت و سامان هەیە، پێت دەڵێن خان، بەڵام نازانم ناوی خۆت چیە؟!

□

**نەقلی(٤٤):**

دەگێڕنەوە پاشای وڵاتێک بۆ خۆشی و رابواردن، زۆر بە ڕاو و شکار خەریک بوو. ڕۆژێکیان بە کوێستانێکی ئەستەم و دووردا لە دووی نێچیردەگەڕا. لەپڕا چاوی بە ماڵێکی مەڕدار کەوت کە لە نزیک کانیاوێکی سارد چادروچێغیان هەڵداوە و ژن و کچی تەرز و لە بار، خەریکی مەڕ دۆشین بوون. مەڕێکی یەکجار زۆر لە بەر بێری بوو، لێیان نزیک بووە و لێیانی پرسین: ئێوە ماڵیات بە دەوڵەت دەدەن؟

وەڵامیان داوە: نەخێر، پادشا بە تووڕەیی یەوە گوتی: جا چۆن لەم هەموو مەڕ وماڵات و داهاتە هیچ نادەن بە دەوڵەت؟ تەماشای ئەم هەموو مەڕە، ئەو

گشتە بەرخ و کاوڕە. ئەو هەموو مەنجەڵە شیرە. گوتیان: تا ئێستا کەس لە ئێمەی نەویستووە و نەپرسیوە، دەنا حازرین باج و باڵیات بدەین بە دەوڵەت.

پادشا خۆی پێ ناساندن و گوتی: من شای ئەم وڵاتەم. دەبێ ماڵیات بدەن.

گوتیان: بەڵێ قوربان دەیدەین. هەرچی ئێوە بفەرموون، سەرمان لە ڕێت دایە.

پادشا گوتی: دەچمەوە و ماڵیاتتان بۆ دیاری دەکەم و دێمەوە.

پادشا ڕۆیشتەوە و ماڵیاتێکی زۆر گرانی خستە سەر خەڵکەکە. بۆ هەر سەری ساڵێ هەزار تمەن و پووتێک ڕۆن و پووتێک پەنیر و خوری یەکەی ماڵیات دانا. هەر چی وەزیر و وەکیلان عەرزیان کرد، قوربان ئەوە زۆرە، بە کەس نادرێ، گوێی نەدایە و گوتی: هەر ئەوەیە کە گوتوومە.

بەڵێ پادشا پاش دوو سێ ساڵ گەڕاوە، بۆ لای ماڵە مەڕدارەکە. چاوی پێکەوت مەڕ و ماڵات هەموو کز و لاواز بوونە. مەنجەڵەکان بوونە قابڵەمەی چکۆڵەو بەرخ و کاوڕ وەک بێچووی پشیلە چکۆلە بوونەوە!

بە سەر سووڕمانەوە پرسیاری کرد: چ قەوماوە، ئەوە بۆ چی مەڕەکان وا کز و لاواز بوون و شیر و ماست و ڕۆن ئاوا لە کەمی دایە؟ ئەو بەرخ و کاوڕانە بۆ ئاوا چکۆلە بونەتەوە!

کابرای مەڕدار وڵامی داوە، قوربان ئەوە پادشای وڵات گۆڕاوە و بەخێڵی بە ماڵی ڕەعیەت دەبا. خوداش ڕسقی کەم کردوە. لە هەر وڵاتێک، گەورە بەخێڵی بە ماڵی خەڵک ببا، خودای گەورە و مەزن، ڕسق و داهات کەم دەکاتەوە.

پادشا بەم قسەیە داچڵەکی و دەستوورەیدا ماڵیاتەکە زۆر کەم بکەنەوە و زیان بە داهات و هەڵسووڕانی مەڕدارەکان نەهێنن.

□

**نەقلی(٤٥):**

لە مەجلیسێکی دادگایی دا ،قەڵەمەکە لە دەستی قازی ئەکەوێتـە خـوارەوە، یەکێ لەوێ بوو، وتی: جەنابی قازی قولەنگەکەت هەڵگرە!

قازی دەڵێ: مەگەر کوێری، قولەنگ لە قەڵەم جیا ناکەیتەوە.

پیاوەکە دەڵێ: هەر چی بێت،ماڵی منت پێ وێران کرد.

□

**نەقلی(٤٦):**

دەڵێن شێخ رەزای تاڵەبانی شاعیری بە ناو بانگی کـورد، لـە سـەفەرێکی بـۆ ئێران، دەچێتە لای ناسرەدین شای قاجار و لە گەڵیا دەست دەکا بە قسە کردن و لە باردۆخی ژیانی پرسیاری لێ دەکا.

کاتێک کە دەیەوێ لـە خزمـەتی شـا دا رۆخـسـەت وەربگـرێ، بـۆ رێزلێنـان کڕنۆش دەبا.لە هەمان کاتدا مێزەرەکەی سەری دادەکەوێت. ئەم روداوە دەبێتە هۆی پێکەنین وگەپ و گاڵتەی شا و ئامادە بووان.

شێخ ڕەزاش بێ ئەوەی تێـک بچـێ، بـەم دوو بەیتـەی خـوارەوە وەڵـامیان دەداتەوە:

| | |
|---|---|
| رسم فرنگیان کلاه از سر گرفتن اسـت | تعظیم چون کننـد خداونـد جـاه را |
| من اکتفا به شیوەی ایـشان نمـی‌کـنم | هم سر به پایت افکنم و هم کلاه را |

□

**نەقلی(٤٧):**

ساڵێک پەهلەوی، شای ئێران، سەرتیپ هوشمەند ناوێکی ناردە سابـڵاغ کـە بە زەبر و زەنگی خۆی، سەر رەقی خەڵکی مەهاباد نەهێـڵێ. ڕۆژێـک سـەرتیپ دێتە ناو بازاڕ، لە پڕ وەک باران، تێکولە شووتی و تەماتە رزیوی بە سەر دادەبارێ و ئیتر سەرتیپ هەر ئەوەی پێدەکرێ، هەڵبێ. ئیتر هەر ئەو رۆیشتنە، رۆیـشت، نەگڕایەوە، بەڵام ناوی دەرکرد بە سەرتیپ پاپیجان:

□

**نەقلی(٤٨):**

دەگێڕنەوە زۆر لەمەوبەر کابرایەکی لادێیی، کوڕێکی پێخاوسی هەبوو. ڕۆژێک لە ڕۆژان داوای لە باوکی کرد کەوشی بۆ بکڕێ.

واهات ئەو کابرا ڕێی کەوتە شار، دەستی بە چاوی گرت، هیچ کونە سەگێک نەمابوو کە سەرێکی تێ نەکێشێ، بەڵام ئەو پارەی ئەو، جووتە کەوشە دڕاوێکیشی بۆ نە دەکرد. بۆ ئەوەی بە دەست بە تاڵی نەگەڕێتەوە گوندەکەی خۆیان و لە لای کوڕەکەی بە درۆزن و بێ بەڵێن دەرنەچێ، کڵاوێکی شاقە پاغی گەورەی کۆن و نوێی کون کونی هەرزان بایی، کە بۆ سەری فیل دەبوو، کڕی و گەڕایەوە گوندەکەی خۆیان.

کوڕەکەی لە دوورەوە بە پیری بابی چوو، لێی پرسی: باوە گیان، ئەمە چەس؟ باوکیشی لە وەڵامدا گوتی: کەسی کاکی! ئەمە کەوشە، بەڵام پێی ئێژن کڵاو... هەر کەوشە و وای پێ دەڵێن.

بەمجۆرە ئەم کڵاوە گەورەی نایە سەر ئەم کوڕە بەستەزمانە بچووکە ساویلکەی خۆی.

□

**نەقلی(٤٩):**

**مامۆستا هەژاری نەمر، کە ژیان و بە سەرهاتەکەی هەزاران پەند و ئامۆژگاری و نەقڵە، دەگێڕێتەوە:**

بە هەزاران تەڵەکە و کەڵەک خۆم گەیاندە جێژنی لاوان لە بوخارست(پێتەختی لەهستان)، دەردی کوردم بۆ ئازادیخوازانی جیهان شی کردەوە، کیژە تورکێک دەسکێ گوڵی پێشکەش کردم و زۆر عوزرخوازی لێ کردم کە کورد لە وڵاتەکەی ئەودا بەر ئەستەمە.

□

**نەقلی (٥٠):**

ڕۆژێکی گورگێکی برسی، لە گەڵ ڕێوی یەک دەبنە هاوسەفەر. لە ڕێدا گورگ زۆری هێرش بۆ دێ. لە پڕ ڕوو لە ڕێوی دەکا و دەڵێ: وەرە هەر کامێکمان پیرتر بووین، ئەویدی بخوا.

ڕێوی دەڵێ: من حازرم، تۆ چەند ساڵ دەبی؟ گورگ گوتی: من زەمانی تۆفانی نووح لە دایک بووم. ڕێوی دەستی کرد بە گریان. گورگ گوتی: بۆ چی دەگری؟ ڕێوی گوتی: بۆ دوو منداڵەکانم دەگریم کە لە تۆفانی نووح دا خنکان.

□

**نەقلی(٥١):**

کابرای هەژار کوڕی بۆ دەرس خوێندن ناردە شار... کوڕەکە داب و نەریتی دێ و خووخدەی خۆی لە بیر چووەوە. هەر کە دەچووە دێ، دەستی لە ڕەش و سپی نەدەدا و کاری نەدەکرد، خۆی با دەدا و خۆی ڕادەدا و دەیگوت: سیکلم!

بابی بە تاقی تەنیا هەموو کارێکی دەکرد. ڕۆژێک گوێدرێژی کابرا مانی گرتبوو و نەدەڕۆیی، کابراش توند نەقیزەکەی تێوەژاند و دەنگی دا: هەچە ... تۆیش سیکلی؟!

□

**نەقلی(٥٢):**

دوو دز پێکەوە دەچنە ماڵێک بۆ دزی. لە نێو ماڵەکەدا، دەگەڕێن. یەکیان دەبینێ تۆورەکەیێک تۆراخ بە دیوارەوە هەڵواسراوە و بە ئەوی تر کە ناوی (سەعە چرچە) بووە بانگی لێ دەکا و دەڵێ: سەعە چرچە بێ بۆ ئێرە لەم تۆراخە بخۆ، بە خوا هێندە خۆشە هەر نەبێت.

سەعە چرچەیش دەڵێ: دەک خوا غەزەبت لێ گرێ، جا چۆن دەتەوێ نەمەکی ئەم ماڵە کەین و دزییان لێ بکەین.( دزیش دزی قەدیم)

□

**نەقلی(٥٣):**

**مامۆستا هەژاری ڕەحمەتی دەیگێڕێتەوە و دەڵێ:**

ڕۆژێک لە قاوەخانەیەک دانیشتبووم چەند دز و چەتە پێکەوە قسەیان دەکرد. یەکیان بەوی دیکەی وت: من هەر شەوێ بچین بۆ دزی سەر لە ئێوارە تۆزێ دەخەوم، ئیتر هەتا بەیان خەوم نایە.

مامۆستا هەژار دەڵێ: ئیتر منیش ئەو شتە لەو دزە فێر بووم هەر کات بمویستایە شەوانە بنووسم سەر لە ئێوارە دەخەوتم و هەتا بەیان چاوم خەو ناچوو.

□

**نەقلی(٥٤):**

**مامۆستا سەیید ئیبراهیم ستوودە دەیگێڕێتەوە و دەڵێ:**

لە یەکێک لە گوندە کوردنشینەکاندا کە ئاغای ئاوایی نیزیک بە هەزار سەر مەڕی هەبوو، پیاوێکی هەژاریش دەژیا کە تەنیا سەرێ مەڕی بوو. ئەم پیاوە هەژارە مەڕی خۆی نەدەبڕییەوە، هەتا ئەو ڕۆژەی کە ماڵە ئاغای ئاوایی مەڕی دەبڕییەوە. جا کە خەڵک لەو پیاوە هەژاریان دەپرسی ئەو ڕۆ چ دەکەی؟ دەیگوت:ئەوڕۆ ئەمن و ماڵە ئاغا مەڕەکانمان دەبڕینەوە!!

□

**نەقلی(٥٥):**

**مامۆستا شیخ نافیع مەزهەر(شپرزە) دەیگێڕێتەوە:**

خوا عافووی کا مامۆستا مەلا وەهابی ئیمامزادە(خەڵکی سەقزە) کە حەحاج لە حەج ئەهاتنەوە، یا مانگی مەولوود ئەهات، لە یەک ڕۆژا لە چەن ماڵەوە چەن کەسێ ئەچوونە خزمەتی و ئەیانوت:

مامۆسا، حاجی عەرزی ئەکردی بۆ نەهار تەشریف بێنێ بۆ مەنزڵ. ئەویش پاش هەولێ بەوانی تری ئەوت: نابێ بۆ شام یا ڕۆژێکی تر بێت؟ عەرزیان ئەکرد:

نەوەڵلا قوربان، هەر تۆ تەنیا نیت، خەڵکێکی زۆر دەعوەت کراوە، ئـەویش ئـەی فەرموو:

(میدهد اما به ترتیب نمی دهد)

یانی: خودا دەیدا ئەما، بە نەزم و تەرتیب نایدا.

**بەشی دووهەم**

# بەسەرهاتی
# بەیتەکانی کوردی

کاری هونەرمەند کاک هادی زیائودینی

## بەیت

بەیت لـە کوردەواریـدا کەلـەپووری نەتەوایەتییـە، کـە دانـەری ئـەو بەیتانـە نەناسراون و لە رۆژگاری کۆنەوە دەماودەم بە گوێی ئێمە گەیشتوون.

ئەم بەیتانە لە بەزم و رەزم، یـان لـە شـیوەن و زاری، بـە زمـانی بـەیت وێـژ خوێندراوە و تا ئێستا بە ئێمە وەک گەنجینەیەکی نەتەوایەتی گەیوە و هەڵـیان گرتووە. بەیت هەر وەها سەبارەت بە رووداوێکی گرنگ، ئەوین، دڵـداری و یـان باسی ئایینی هۆنراوەتەوە و پاراستوویانە. لە ناو بەیت وێژاندا، عەلی بەردەشـانی کە بە شێوەی کرمانجی بەیتی داناوە، زۆر ناسراوە.

یەکێکی دیکە لە بەیت وێژانی ناسراو، مەلا حەملە کوێرە. ئەم بەیت وێژە لـە ساڵی ١٣٥٧ی کۆچی دا مردووە. ناو براو خەڵکی جوانرۆ بووە، و زۆربەی ژیـانی لە شەڕدا رابواردوە. مەلا حەملە پیاوێکی نەخوێندەوار و کوێر بووە، بەڵام لە بـەر ئەوەی بەیت وێژێکی وریا و تێگەیشتوو بووە، و گـەلێ لـە سـوورەکانی قورئـانی پیرۆزی لە بەر بووە، خەڵک لە کاتی قسە کردن دا نازناوی "مەلا" یان بۆ بە کـار هێناوە و پێیان ئەوت "مەلا حەملە".

**بەیتەکان ئەکرێتە چوار بەشەوە:**

**یەکەم: بریتی یە لـە بـەیتی دڵـداری**، کـە بەسـەرهاتی رووداوی دڵـداران، ئەگێڕێتەوە. وەکو: بەیتی مەم و زین، خەج و سیامەند، خورشیدوخاوەر، لاس و

خەزاڵ، میر و وەفا، فەرهاد و شیرین، گوڵناز و کەلاش، لەیلا و مەجنوون، وەنەوش و بەڕەزا، یوسف و زولێخا.

**دووهەم: بەیتی خواناسی،** کە لەوەدا سەبارەت بە خواناسی و ڕۆژی پەسڵان و کردەوەی چاک و ڕووداوی پیاو چاکان باس کراوە.

وەکو: بەیتی ئیمام حەمزە، حەمە حەنیفە، زەمبیل فرۆش، شێخ عوبەیدوڵلای شەمزینان، شێخ عەبدولقادر، مزگەوت و میرزا، ئەسپی ڕەش.

**سێهەم: بەیتی شەڕ و شۆڕ،** کە لەوەدا باسی ڕووداوەکانی مێژوویی و شەڕەکان ئەکات. وەکو بەیتی قەڵای دمدم، لەشکری، بەدرخان پاشا، دوانزدە سوارەی مەریوان، سواری جوانڕۆ، شای زەند، شۆڕە لاوی زەند، گەنج خەلیل پاشا، نادرشا، نادرنامە، میری ڕەوەندی.

**چوارەم: بەیتی داوەت،** کە ئەم بەیتانە لە کاتی زەماوەن و گۆبەند وداوەتدا، ئەخوێنرێتەوە. واتە: لە کاتی هەڵپەرین دا ئەخوێنرێتەوە. وەکوو بەیتی: شەم و شەم زین، ئاسکۆڵە، ئایشە گوڵ، ئاگری، باوانم، بولبول، پیرۆزە، جولەندی، سیاچەمانە، شەمێ شەنگە، فریشتە، کەویار، گوڵە زەرد، میرانە، وەنەوشە، یاس گوڵ و یاری.

هەندێ لەم بەیتانە وەکو بەیتی سەعید و میر سەیفەددین بەگ، زۆر درێژە و ناوەرۆکی زۆربەی بەیتەکان ڕووداوەکانی مێژوویی و کارەساتی ناوخۆی کوردستان و بە سەرهاتی پیاوە گەورەکان و ڕووداوی دڵداران دەگێڕتەوە.

**ناوی دانەرانی هەندێ لە بەیتەکان:**

عەلی بەردەشانی، ئەحمەدی کوێر، لەشکری، خەمە ئاسمانی، قاسم هەوشاری، هەلکەتی و خزنال، حەمە بەنگینە، مامە شێرە، حەسەن سووتاو، بەشیر بەگ، فەتتاح بەگ، حوسین کەینلە، میرزا بایەزید، سۆفی شەریف، عەلی بەگ، حەمە سوور، جیهانگیربەگ، حاجی ئەحمەد ڕەش، حەمەدی ئاغا و ڕەحمان بەکری موکری.

هەندێکیش لەو بەیتانە کۆ کراوە و لە لایەن مامۆستا محەممەد تۆفیق وردی، مامۆستا حاجی جوندی، مامۆستا قەناتی کوردۆ، مامۆستا عوبەیدوڵڵای ئەیوبیان، مامۆستا قادری فەتتاحی قازی، کاک عەبدولحەمیدی حوسێنی کۆ کراوە و لە چاپ دراون.

بەیت، بە نرخ ترین هونەری کوردە کە پڕە لە ڕەمز و سومبول، لە بەر ئەوەی زۆرداران و خاوەن دەسەڵاتەکان، ڕاستەوخۆ، مانای ئەو هونەرە پێ نەزانن، هونەرمەندی کورد دەردی خۆی زۆرتر لە چوار چێوەی ڕەمز گوتووە.

بەیت بێژ لە گێڕانەوەی خۆیدا وا باسی قارەمانی چیرۆکەکەی دەکا کە گوێگرەکان بە تەواوی لە گەڵ قارەمانەکەدا ئاشنا دەبن،چونکە ئەوەی بەیت بێژ دەیڵێ، لە قووڵایی ناخ و سەرچاوەی دەروونیەوە هەڵدەقوڵێ، کە بە دەنگ دانەوەی هەستی تەواوی جەماوەر لە ماوەی مێژوو دایە. هەر چەن ڕواڵەتی زۆرتری بەیتەکان ئەوین و دڵدارییە، بەڵام لە ڕاوەستاوی و سەربەستی قارەمانەکان بەرانبەر بە زوڵم و زۆر دەدوێ. لە زۆرتری بەیتەکاندا، لە نێوان دوو ئەویندارردا، هەمیشە شتێک وەک دڕک پەیدا دەبێ کە دەبێتە لەمپەرێک، لە بۆ پێک نەگەیشتنی ئەویندااران. یاکوو پیاوێکی خوێڕی قارەمانی داستانەکە دەکوژێ و تەواوی هەوڵ و تێکۆشان و مەردایەتی قارەمان بە فیڕۆ دەچێ و گریان و قوڕ پێوان جێی دەگرێتەوە.

لە زۆربەی بەیتەکاندا قارەمان دەگاتە ئەو پەری توانا، ئازایەتی، پیاوەتی، لە خۆ بوردوویی، فیداکاری و...، بە گشتی کەسایەتی تایبەتی دەدەن بە قارەمان. ئەگەر بە وردی لە نێوەرۆکی بەیتەکان بڕوانین، بۆمان روون دەبێتەوە کە تەواوی ئەم ئازایەتی و زاڵ بوون بە سەر زۆردارانـدا، بۆ قەرەبوو کردنەوەی کەسایەتی میللی یە. یان لە بەیتدا تەواوی کەم و کووڕی و هیوا و ئاواتی میللی لە کەسایەتی قارەماندا خۆی دەنوێنێ.

زۆر جار بەیت ڕەنگی ئەفسانە بە خۆیەوە دەگرێ، یان بە واتەیەکی تر ئەو دەمەی قارەمانی بەیت، تێک دەشکێ و ناتوانێ بەو چەشنەی کە دەیەوێ بە ئامانجی خۆی بگا، لە خە یاڵدا کەم و کوورییەکە ی خۆی قەرەبوو دەکاتەوە و بە ئەفسانە و خەیاڵ پەنا دەبا، بۆ پاراستنی حوورمەت و دیفاع لە کەسایەتی خۆی بە چەشنێکی خەیاڵی و بە هێزێکی جادوویی، تەواوی فڕ وفێڵەکانی دوژمن بەر پەرچ دەداتەوە.

لە زۆرتری بەیتەکان حاکم یان پاشا، لیباسی پڕ شکۆی خۆی وەلا دەنێ و جلی فەقیرو هەژاران دەکاتەوە بەر و خۆی لە ریزی ئەواندا دەنێ بۆ ئەوەی بسەلمێنێ کە، کەسایەتی قارەمان لە جل و بەرگی بە نرخ و رازاوەدا دیاری ناکا، بەڵکوو کەسایەتی یەکی بەرز و نەگۆڕاوە و ئەمە کەسایەتی یەکی ڕاستی یە، نەک خەیاڵی.

**هووشەنگ جاوید** لێکۆڵەری مۆسیقای ناوچەیی سەبارەت بە بەیت بێژی لە نێوان کوردەکانی رۆژئاوای ئێران دا دەڵێت: بەیت هەندێ جار(هجایی) یە و جار جاریش(مصراع) ێک لە بەیت ڕەنگە درێژتر یان کورت تر لە پێشووی بێت.

هەر وەها سەبارەت بە پلەی بەیت بێژان لە ناوچەی ئازەربایجانی رۆژئاوا تا ئیسلام ئاوای کرماشان وتوویە: کە بەیت بێژان بە بەشداری سەرۆک و فەرماندەکانی پێشوو و هەر وەها کۆڕ و کۆ بوونەوەکانی خەڵکی، خاوەنی رێز و شکۆ بوون، هەندێ جار بە چەشنی ئاسایی، بەیتێکی نوێیان سەبارەت بە سەرۆکێک یا ئەویندارێکی خەباتکار و.. دەخولقاند و پاشان بەرە بەرە دەمایەوە و بەیت بێژان و باڵورە بێژان بێ تەگەرە و بێ ترس لە هەر شوێنێک دا بێت، گۆرانی یان دەچڕی، چوونکە کەس لێیان توورە نەدەبوو، هەر وەها سەبارەت بە مێژووی ئەم بەیتانە مامۆستا جاوید رایگەیاند:

**سێ کەس لە زانایانی مۆسیقای کوردی کە بریتین لە:**

١ـ مامۆستامەلا جەمیل ئەفەندی ڕۆژبەیانی

٢ـ دوکتورعیزالدین مستەفا رەسووڵ

٣ ـ مامۆستا جەبار جەباری

**روانگەیان ئەوەیە کە:** هەندێ لە گۆرانی و ئاوازی بەیتەکان مێژوویەکی زۆر کۆنیان نییە و زۆربەی بەیتە بە جێ ماوەکان، لە ناوچەی گەرمیان واتە: کەرکووک، تاڵەبان، جەباری، ئاڵیاوە، گوندی قادر کەرەم و دەشتی زەنگنە، بەیتەکان دەزانن. و دەڵێن: بەیتەکانی(قەتار و خاوکە و ئای ئای ـ ئەڵلا وەیسی و.. لەم ناوچەیە سەریان هەڵداوە.

لە درێژەدا رایانگەیاند:

گرینگترین ناوچەکانی باو بوونی بەیت لە رۆژئاوای ئێران، ناوچەکانی مەهاباد، بۆکان، سەردەشت، کرماشان و ئیلامە.

**شارەزایانی مۆسیقای ناوچەی کرماشان و ئیلام بروایان ئەوەیە:**

کە دەقی ئاوازەکانی بەیت لە ٥٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا لە لایەن کەسێک بە ناوی (خەسرەو فیرووزخان) کە لە مەکتەب خانەی کەسێکی زەنگەنەیی بە ناوی (تەیموور)بەیتی دەچڕی،دانراوە و پاشان دەچێتە شارەزوور، دەبێتە هۆی گەشە پێدانی بەیت بێژی.

**ئەم لێکۆڵەرە سەبارەت بە بەیت بێژی لە نێوان کوردەکانی باکوور و رۆژهەڵاتی ئێران(کرمانجی باکوور)دەڵێ:**

شوێنی ژیانی کرمانجەکانی باکوور لە ناوچەی تەرگەوەر و مەرگەوەر لە ئازەربایجانی رۆژئاوا، تا گیلان، مازەندران، تاران، گوڵستان و تا شوێنی سالح ئابادی توربەت جام، بەربڵاوە.

بەیت لە نێوان کوردەکانی خۆراسان، بە چەند جۆر خۆی دەنوێنێ، لە لقەکانی حەماسە بێژی، بەیتەکانی کرمانجی باکووری لە ئاستی سیستەمی

ئەدەبییەوە لە گرووپی دووهەمن، کە لـە بەرانبـەری و یەکسانی (مـصراع) زۆر ڕێک و پێکن، بۆیە بەخشیەکان (کوردەکانی خۆراسان) لە کاتی خوێندنی بەیت دەست دەدەنە ئافراندنەوە.

لە کۆتایی دا وتی: بەیتەکانی کوردی چ لـە ڕۆژهـە ڵـات و چ لـە ڕۆژئـاوا و باکووری ڕۆژهەڵات ... هەموویان لە ئاستی بەڕێوە بردنی، لە سروشـت کەڵـک وەردەگرن. بۆن و بەرامەیان لە باخ و گولستان بەهرەمەندە و ناوەرۆکی ئەوان لە قووڵایی چەمەکان و دوڵەکان، بیرەوەری لە خـەم و پـەژارە و لابـردنی ڕەنـج و دەردە. و جوانیەکەی لە سـروەی چیـاوە سـەرچاوەی گرتـووە و بـەم چەشـنە گەنجینەیەکی پڕ بایەخ لە رابردووی ئەدەب و فەرهە نگی وڵات پێک دێنێت.

**بەشەکانی بەیتی کوردی**

بەیت بەشێکی گرینگ لە فۆلکلۆر و ئەدەبیاتی کوردی پێک دێنێ کە نووسەر یان دانەریان نەناسراون و سینگ بە سینگ، دەیان و سەدان ساڵ گـەڕاون و بـە دەست ئێمە گەیشتوون.

**بەیتی کوردی سێ جۆرن:**

١ـ هۆنراوە و شێعر وەک: بەیتی دمدم، کە بـە شـێوەی کلاسـیکە و بـەیتی گوڵێ، کە لە سەر شێوەی شێعری نوێیە.

٢ـ پەخشان: وەک بەیتی "مەڕزینگان".

٣ـ تێکەڵاوێک لە شێعر و پەخشان وەک: بەیتی حوسەین چاوپان.

**لە بارەی نێوەرۆکیشەوە بەیتەکان جۆراوجۆرن:**

بەیتی مێژوویی وەک: بەیتی دمدم.

بەیتی رامیاری وەک: بەیتی ناجی عومەر.

بەیتی فەلسەفی وەک: بەیتی زەنبیل فرۆش.

بەیتی وەسفی وەک: بەیتی گوڵێ.

بەیتی ئاشقانە وەک: بەیتی خەج و سیامەند.

بەیتی ئازایەتی و حەماسی: بەیتی سەیدەوان.

بەیتی پێکەنینی وەک: بەیتی کەرێ و بەیتی مشک و ئاشەوان.

**ئەو بەیتانەی کە بە زاراوەی سۆرانی دانراوە بە پێی پیتی ڕێزمانی کوردی ئەمانن:**

ئـ ـ ئازیزە ـ ئاغای بەمیزەریان ـ ئاو ڕەحمان پاشای بەبە ـ ئایشە خان ـ ئایشە گوڵ ـ ئەحمەدی شەنگ ـ ئەسپی ڕەش ـ ئەهنە ساو بە هنەسا ـ ئیمامی هەمزە.

ب ـ بارام و گوڵئەندام ـ برایمۆک ـ برایمی مەلا زیندنیان ـ برزو و فەلامەرز ـ بەهارە ـ بەهنە سا ـ باپیر ئاغای مەنگوڕ ـ بیژەن و مەنیژە.

پـ ـ پیرۆز ـ پیرەار ـ پیوازان.

تـ ـ تفەنگ ـ ترکان ـ تیری دڵداری.

جـ ـ جوولەکان ـ جوامێر و دایکی ـ جوڵندی ـ جهانگیر و ڕۆستەم.

ح ـ حەزرەتی ئیسماعیل.

د ـ دوو برالان.

ر ـ ڕێوی.

س ـ سمکۆ ـ سیسەبان.

ش ـ شانامە ـ شای جندۆکان.

ع ـ عەبدوڕەحمان ـ عەلی و پیرێژنی شایەر ـ عەلی و شایی و هەڵپەرکێ.

ف ـ فەقێ ئەحمەدی دارشمانە.

ک ـ کەوشی ڕەش ـ کیسەڵ.

م ـ مەلا خەلیل گوڕەمەڕی.

هـ ـ هەنار.

جەنگ نامەی کەهیا پاشا ـ جەنگ نامەی هەورامان ـ چیغ و زێڕین ـ خوازی ـ خوازو کانەبی ـ خوازو عمان ـ خورشید و خاوەر ـ خورشید و خەرامان ـ خەج

و سیامەند ـ خەلیل پاشا ـ خەیاڵ ـ درکان ـ دم دم ـ دوانزدە سوارەی مە ریوان ـ ڕۆستەم و زۆراب ـ ڕۆیشتنی عەلی بۆ مەرگـە ـ ڕەمـەزان و عـەلی ـ زریێبـار ـ زەنبیل فرۆش ـ زەینەڵ و گوزەل ـ سام سام ، سـایل ـ سـواروی ئایـشەگـوڵ ـ سواروی سنجانی ـ سەعید و میر سـێوەدین بـەگ ـ سـەنجەر خـانی نـەرانی ـ سەیدەوان ـ شـاکە و مەنـسوور ـ شـۆڕ مـەحموود و مـەڕ زینگـان ـ شـەریف و شیرین ـ شەم و شەمزین ـ شەو و نیوە شەو ـ شێخ فەرخ و خـاتوون ئەسـتێ ـ شێخ مەند و شێخ ڕەش ـ شێخی سەنعان ـ شیرین و فەرهاد ـ عوسمان پاشـای بەبە ـ عەزیز و کوبرا - عەلی بەردەشانی و دڵداری ـ عەلی و سێ برادەری ـ قەڕ و گوڵەزەر ـ کاکەمیر و کاکە شێخ ـ کەڵ و شێر ـ گوڵـناز و کـەلاش ـ گەڵـو ـ گەنج خەلیل پاشا ـلاس و خەزاڵ ـ لەشکری ـ مەم و زین ـ میهر و وەفا ـ ناسر وماڵ ماڵ ـ وەنەش و بەڕەزا ـ هەمزە ئاغای مـەنگوڕ ـ یـای ئەسـتێ ـ یوسـف و زولێخاـ یوسف و سەلیم ـ ئازیزە ـ مەمی ئاڵان ـ مـیرزا قەڵـای خـاو ـ زەینـەل بەگ، تەنیا بەشێکن لە هەمووی ئەو بەیتانەی کە بە ئێمە گەیشتوون.

دیارە بەیتی کوردی زۆر زیاتر لەمانەن، کە ناویان هاتووە و ئێستا بـە داخـەوە هەندێکیان فەوتاون.

□

## بەیتی ئاغای بایزی

بەیتی ئاغای بایزی، باس لە سوارچاکی و دلێری کوردان دەکـا، کـە بـە گـژ سوپای ڕەزا خانی پەهلەویدا چوون، ڕەزا شا لە سـەردەمی خۆیـدا بـە حـوکمی دەسەڵاتی سیاسی و چەکمەی قورسی خۆی، هەر چی پێی خۆش بـوو، بـڕیاری لە سەر داوە، جا ئەگەر ئەو بڕیارە لە زەرەر و زیانی میللەتانی تریشدا بوو بێ، ئەو هیچ گوێی لێ نەبووە. خۆی خـاوەن دەسەڵـات بـووە و حـوکمی خـۆی چـۆن کەیفی لێ بووبێ، وا لێی خوڕیوە.

دەوڵەتی ڕەزا شا، بەرگی کوردی و سیمای نەتەوایەتی کوردی قەدەغە کرد، دەبوایە کوردانیش بە زۆرەملی بەرگی خۆیان فڕێ دەن و کۆت و شەڵوار لە بەر کەن و شەبقە لە سەر نێن. کوردیش ملیان نەداوە و لێی ڕاپەڕیون.

**"بایز ئاغا و مەلای گۆڕەمەڕ"** وەکوو بەیت بێژ دەڵێ: لەشکرێک دەخەنە ڕێ و بەری سوپای رەزا شا دەگرن. لەشکر سوار بوو دەرۆیی، لە گەڵ لەشکر "دایە تام بێژ" مەقامی بۆ لەشکر وتووە و لە چەشنی مۆسیقا و کەرەنای سەربازی ئەو سەردەمە، کوردیش مەقام بێژی داناوە بۆ پیاهەڵدان و هاندانی سوارە و لەشکر.

□

## بەیتی برایمۆک

ئەم بەیتە بەیتێکی زۆر ناسراو و ناوادارە کە لە لایەن "ڕەحمان بەکری موکری"وە بۆ ئۆسکارمانی ئاڵمانی گێڕاوەتەوە. چیرۆکی دڵدارێکە بە ناوی "برایم" کە نۆکەری ئاغایێک دەبێت و دڵی لە خۆشکی ئاغاکەی خۆی دەچێت و لەو ڕێگایەدا زۆر رەنج و جەفا دەکێشێ.

ئاغاکە نەخۆشینی گولی دەگرێت و حەوت ساڵی ڕەبەق دەیگێڕن و بە دەرمانێکی سەیر ساخی دەکەنەوە. "میر شێخ" ئاغای برایمۆک لە کاتی نەخۆشیندا، بەڵینی دابوو "پەریخان"ی خۆشکی بە برایمۆک بدا. تەنانەت سوڵتانی عوسمانیش ئەو باوەڕەی مۆر کردبوو، بەڵام براکەی دیکەی میر شێخ بە ناوی "میر حەج" بەم کەین و بەینە دەزانێت و رەگی دەربەگایەتی بزاوە، ناهێڵێ ئەم کارە بکەن و ناپیاوانە لە کاتی زستاندا بە بەفر و سەهۆڵ بەندان، برایم دەرئەکەن و پەنی بە سەر دادێنن.

برایمۆک بۆ ڕۆژ ڕەشی خۆی ئەم بەیتەی وتووە و باسی دوری خۆی لە خاتوون پەریخان دەکات و سۆزی دەرونی هەڵئەقرچێنێ.

برایمۆک بە هەزار کوێرەوەری و چەرمەسەری خۆی دەگەیێنێتەماڵی میر شێخ ئاغاکەی خۆی و میر شێخیش ئەمەگی برایمۆک دەداتەوە و لە ئەنجامدا خاتوون پەریخانی خۆشکی بۆ مارە دەکات و برایم بە ئاواتی خۆی دەگات.

□

## بەیتی برایمی مەلا زێندوینی

**بە سەرهاتی ئەم بەیتە کە بە "بەیتی برایمی مەلا زێندوینی" بە ناو بانگە بەمجۆرەیە:**

گوایە "**میر شێخ**" نەخۆش دەکەوێ و (گڕوو دەبێ) دەرمان نامێنێ بۆی نەگرنەوە، بەڵام بێهوودە. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ نەخۆشییەکەی زیاتر پەرە دەستێنێ و توندتر دەبێت.

"**براکەی میر یەحیا**" بڕیار دەدات کە بینێرێتە وڵاتی فەرنگستان کە پزیشک و پسپۆڕی باشی لێیە، بەڵکو چارەی بکەن. کاری ئەم سەفەرەش بە "**برایمی مەلا زێندوینی**" دەسپێرن.

کە دەکەونە ڕێگا، فکریان دەگۆدرێ، بەرەو ئەستەمبووڵ دەکەونە ڕێ. ڕۆژی هەینی برایم لە بەر درگای مزگەوتی سوڵتان، نوێژ دەکات و چاوەڕێی هاتنی دەبێت، سوڵتان پارە و پوول دا دەبەخشێ و برایم وەری ناگرێ، سوڵتان بەم کارە سەر سام دەبێت، دەڵێ چیت دەوێ؟ برایم دەڵێ: نەخۆشێکم لە گەڵدایە حەوت ساڵە دەیگێڕم زۆر پزیشک و زانا و پیاو چاکم پێ کردووە، بەڵام هیچ ئەنجامێکم دەست نەکەوتووە. هاتووین لە نوێژی هەینی، جەنابتان لە خودا بپاڕێنەوە، بەڵکو نەخۆشەکەمان شیفای بۆ بێت. پاش نوێژ سوڵتان دەڵێ لە خوا پاڕامەوە و پەنام بردووتە بەر پیاوچاکان و پیرەکانیش، بەڵکو دۆعام بە چاک بگەڕێ نەخۆشەکەتان چاک بێتەوە.

منیش هیوای چاک بوونەوەتان بۆ دەخۆازم و پێستێکی کورکدار بە خەڵات، دەداتە برایم بۆ ئەوەی بیدا بە سەر نەخۆشەکەی و ئازاری پێنەگا.

هەوار بە هەوار بەرەو وڵات دەگەڕێنەوە. بۆ پشوودان لا دەدەنە سەر کانیاوێک، لەو نزیکەش غەرە بەردێک دەبێت. میرشیخ بە برایم دەڵێ: زۆر برسیمە، برایم چاو دەگێڕێ، دەبینێ شوانێک لەو لاوەیە مەڕ دەڵەوەڕێنێ، داوای لێدەکات کە بڕێ شیریان بداتێ بۆ نەخۆشەکە، ئەویش دەڵێ: چیم لا نییە شیری تێکەم، بڕۆ کۆنە هەوار بەڵکوو بنە گۆزەیێک بدۆزییەوە.

ئەویش دەیهێنێ و دەیداتە شوان و دەڵێ: دەبێ شیری مەڕی ڕەشم بۆ بدۆشی، چونکە شیری مەڕی ڕەش دەرمانە.

شیرەکە دەبا لە هەمبانەکە هەندێ وردە نانی ڕەق دەردێنێ وتێی دەگوشێتە شیرەکە و لە سەر غەرە بەردەکەی دایدەنێت، بۆ ئەوە ی چاک بخووسێت.

برایم دەچێتە سەر کانییەکە، دەبینێ مارێکی ڕەش لە غەرەکەوە، دێتە دەرەوە دەچێ نان و شیرەکە دەخوات و پاشان هەمووی دەهێنێتەوە (قای دەکاتەوە) ناو پارچە گۆزەکە.

میر شێخ لە تاو برسییەتی ناچار دەبێ ئەو شیرو نانە بخوات یان چاک دەبێتەوە یان دەمرێ. هەر چەندە برایم دەڵێ مەیخۆ، ئەو هەر دەیخوات و بێ هۆش دەکەوێ، پاشان دێتەوە هۆش. خۆی هەست دەکا، گۆڕاوە. دەڵێ: خەم مەخۆ وا بزانم ئەو نان و شیرە خودا کردی بە دەرمان بۆ من.

دوای سێ چوار ڕۆژ وەک سلقی سووری لێدێت و بە یەکجاری چاک دەبێتەوە. هەوارەکە بە جێ دێڵن و بەرەو گوندی بەردە سۆران دەگەڕێنەوە.

□

## بەیتی جندۆکان

بەیتی جندۆکان مامۆستا عەلی بەردە شانی دایناوە.

□

## بەیتی جولندی

بەیتی جولندی ناوێکی ناخۆشە، کە شایەر بۆ پادشایەکی کافر دایناوە کە لـە گەڵ حەزرەتی عـەلی بـە شـەڕ هـاتووە و تێکەڵـاوێکە لـە شـەڕی خەنـدەک و خەیبەر.

لە پێشدا بە قسەوە دەست پێ دەکـات و دوای دەبێتـە شـێعر، ئـەم بەیتـە گۆمان وایە هی عەلی بەردەشانی شایەری ناوداری کوردە، کە بەیتەکەی دانـاوە و بە شێعر خوێندویە. یان هی ڕەحمان بەکرە کە شاگردێکی عەلی بەردەشـانی بووە.

لەم بەیتەدا، کە بەیتێکی ئـایینی و دڵـداری یـە، باسـی عەشـقێکی پـیرۆز و خاوێنی هێناوەتە گۆڕێ کە لە نێوان ژن و پیاوێکی موسلمان پێک هاتووە.

□

## بەیتی خەج و سیامەند

خەج و سیامەند ئامۆزان، خەج حەوت برای دەبێ، سیامەند کەیخودا و ردێـن سپیان، هەڵدەگرێ و دەچێتە سەر بەڕەی ماڵی مام، بەڵام خـەجێی نـا دەنـێ. سیامەند خەج هەڵدەگرێ و دەیباتـە چیـای سـپیان، هـەر دوو زۆر شـەکەت و ماندوون.

سیامەند سەردەکاتە سەر ڕانی خەج و خـەو دەیباتـەوە. لـەو دەمـەدا خـەج دەڕۆانێتە تیرەگی چیا، تەماشا دەکا کەڵێکی گچکە گامێشێکی داوەتە بەر خۆی و حەوت کەڵ بە دوایەوەن. هەر جار ناچار شاڵـاویان بـۆ دەبـاو لـە گامێـشەیان دوور دەخاتەوە.

خەج کە ئەمە دەبینێ، غوربـەتی هەڵـیدەگرێ.چەنـد دڵـۆپێ فرمێـسک لـە چاوی دێتە خوار و دەکەونە سەر ڕوومەتی سیامەند. لە خەو رادەپەڕێ. بە خەج دەڵێ: بۆ دەگری؟ خۆ بە زۆر نەمهێناوی! ئەگەر دەڵـێی هـەر ئێـستا بتبەمـەوە ماڵی باوکت!

خەج دەڵێ: نا سیامەند، پەشیمان نیم. چاو لێ بکە ئەو کەڵە گچکە، چلۆن ئەو گامێشەی لەو حەوت کەڵە ئەستاندووە! سیامەند دەست دەداتە چەک. خەج دەپاڕێتەوە، گوێی ناداتێ و پاڕێزیان بۆ دەبا، لە ڕەوەزێک کەڵە گچکە دەپێکێ. خەنجەر هەڵدەکێشی سەری ببرێ، کەڵە گچکە سەر رادەوەشێنێ و سیامەند بە سەر پەلی دارەبەنێ دا هەڵدەدێرێ. خەج کە ئەم حاڵە دەبینێ، هەر لەو شوێنەوە خۆ هەڵدەدیرێ. هەر دوو بە نامورادی سەر دەنێنەوە.

دەقی ئەم بەیتە لە ساڵی ١٣٣٧ی هەتاوی لە لایەن کاک "**موحەممەدی ریانی**" بۆ کۆتایی نامەی دەوری لیسانس بە زمانی فەڕانسە وەرگێڕدراوە. جگە لەمانەش بە زمانەکانی فارسی، ئاڵمانی، ئینگلیزیش وەرگێڕاوەتەوە و چاپ کراوە.

□

## بەیتی خەزیم

ئەم بەیتە شاکاری ئەدەبی کوردییە و زۆر وەستایانە هۆنراوەتەوە. کە ڕەنگە، عەلی بەردەشانی یان وەستایەکی قابیلی دیکە دایناوە. لە ئاخری بەیتەکە گوتراوە:

هەزار ڕەحمەت لە بابی ڕەحمانی
خەزیمی فێر کرد بە ساحیب ئاڵمانی

کە دەردەکەوێ ئەو بەیتە ڕەحمان بەکر بۆ ئوسکارمانی گێرابێتۆ و تۆماری کردووە. دیارە ڕەحمانبەکریش شاگردێکی یەکجار باشی عەلی بەردەشانی بووە.

بەیتی خەزیم باس لە ئەوینێکی ساکار و جوان و لەتیف لە نێوان کچ و کوڕێکی کوردی هەژار دەکات، کە کوڕە هەمووی سامانەکەی بریتییە لە خێوەتێکی شڕ و پەتۆز، دوو پیرەکەری پشت بریندار، تاژییەکی نینۆک شکاوی

قرخە مەڕەس، جووتە کەوێکی ڕاو نەکەری چو، دوو تەشی و چوار شانە دروست دەکات.

لەو لاشەوە کچە دۆمێک کە لە بن خێوەتدا لە دایک بووە و لە بـن ئاسمـانی شین دا گەورە بووە، پێستی کەلەکەی بە درزی کراسی خامی شین دا دیـارە و قامکی پێیان بە کونی کلّاشی کەچ دا وەدەرکەوتووە و ڕۆژێ دەبێ چوار دێیـان بگەڕێ تا چەند خول خولە و تەشی و شانە و چەند زار بنێشت و کەمێک دمکانە بفرۆشێ.

□

## بەیتی خەیالّی

بەیتی خەیالّی یەکێکە لە کورتە بەیتەکانی کوردی، کە ڕوالّەتێکی تراژیـدی خەمناکی هەیە و ڕەنگە بە سەرهاتێکی ڕاستەقینەش بێ.

**"خەیالّ کچی حەسەن بەگی شوانکارەیە"**، شوانکارە تایفەی گەورەی خێلّی جافە و لە کات و سەردەمی خۆیدا، خـاوەن دەسەلّـات و بـە بیـاو بـڕۆ بـوون و نەخشێکی گرنگیان لە مێژووی کوردستاندا هەبووە.

ئێستا ئیلی جاف لە ڕۆژئاوای کرماشـان، لـە نێـوان ناوچـەی ژاوەرۆی سـنە، سـنجاوی، پـاوە و گـۆران دا دەژیـن و چەنـدین شـارۆچکەی گـەورەی وەک ڕەوانسەر، جوانڕۆ، بانگیان و .. پێـک هێنـاوە و لـە دەشـتی زەهـاو و سـەرپێلی زەهاو دەژین.

تایفەی شوانکارەش کە بەشێکن لەم خێلّە گەورەیـە، هێنـدێکیان ئێسـتا لـە بەینی جوانڕۆ و ڕەوانسەر و قۆری قەلّادان و بەشـی گەورەشـیان لـە نـاو خێـلّی کوردی گۆراندا دەژین.

خەیالّ کچی حەسـەن بـەگی شـوانکارە سـەرۆکی عێلـی شـوانکارە دەبـێ، دەیەوێ بە گەمیەو کەلّەکی کوێـستانچییان، کـە چـادر و چیـغ و مالّـاتی پـێ دەپەڕێننەوە، بپەڕێتەوە. خەیالّ ئافرتێکی یەکجار جوان دەبێ، گەمیەوان ئاشقی

دەبێ و داوای ماچێکی لێ دەکا، خەیاڵ نایداتێ، ئەویش خەیاڵ لە چۆمی سیروانێ دا دەخنکێنێ.

ئەم کورتە بەیتە هاوینی ساڵی ١٣٥٥ی هەتاوی حەمەدی ئاغای گوتوویە، لە سەر کاسیت و شریت زەبت کراوە.

پیاوەکانی خێڵی شوانکارە تیراندازی لە گەمیەوانی دەکەن و بە تۆڵەی خەیاڵ، گەمیەوان لەگۆمی سیروان دەخەن.

□

## بەیتی زەنبیل فرۆش

لە شاری بۆخارا پاشایەک بووە دوای مردنی خۆی کوڕەکەی دەبێتە پاشا. دوای ماوەیەک کوڕەکەی لە گەڵ جەماعەتێکی ژێردەستی خۆی، دەچنە ڕاو و بە دوای نچیردەگەڕان. کوڕی پاشا دەبینێ جەماعەتێک کەسێکیان لێ مردووە و بە خاکی دەسپێرن. تەماشا و سەیری مردوەکە ئەکات دەبینێ تەنیا بە کەفەنێکەوە دەیخەنە ژێر خاک، کوڕی پاشا دەڵێ: ئەمە بۆ وای بە خاک دەسپێرن، بێن لێفەو دۆشەکەیەکی بۆ بێنن و تێیەوە بیپێچن. پرسی ئەگەر منیش بمرم هەروا دەمنێژن؟!

دەڵێن: نە تەنیا تۆ، بەڵکوو باوکی تۆشمان بەم جۆرە بە خاک سپارد. کوڕی پاشا بەم قسانە دونیای لە بەر چاو تاریک دەبێت. بە دوای ئەوە، تەختی پاشایی بە جێ دێڵێ و روو لە وڵاتان، ئاوارە دەبێت تا ئەوەی رێی دەکەوێتە کوردستان.

دوای ماوەیەک گەڕان دێتە ناوچەی سەقز و تێدەفکرێ چی بکات کە حەڵاڵ بێت و بەشی کەسی بە سەرەو نەبێت. وا بە باش دەزانێ، باشترین ئیش، دروست کردنی زەمبیلە، کە لە تووڵی چەم درۆستی دەکەن.

دەچێتە ئاواییێک کە لە دواییدا بە (زەنبیل) ناو دەر ئەکات. بە تووڵی چەم زەنبیل و سەوەتە دروست ئەکات و دیفرۆشێ.

بۆ فرۆشتنی ئەو زەنبیلانە ڕوو لە شاری"بەقسقە" ئەکات کە لە جێگایەک بە ناوی تەپۆلکەی نزیک شاری سەقزی ئێستا بووە کە جێگای حکوومەتداری بووە، زەنبیل فرۆش لەوێوە تێدەپەڕێ و بۆ فرۆشتنی زەنبیل هاوار ئەکات. ژنی پاشا لە بەر هەیوانی ماڵەکەی چاوی بە زەنبیل فرۆش ئەکەوێ و زۆر خۆشی لێی دێت. بانگی ئەکات بێتە نزیکیەوە، پێی دەڵێ: تۆ شێوەت بەم کارە ناخوا، داوای لێ دەکا، لەم کارە دەست هەڵگرێ و بێتە لای ئەو و بێتە پاشای ئەو شارە. بەڵام زەنبیل فرۆش دەڵێ: وازم لێ بێنە، ئەگەر زەنبیلت دەوێ بیکڕە، ئەگەریش نا، با بڕۆم. زۆری بۆ دێنێ و بە زۆر دەیباتە ناو دیوەخان و لەوێ زەنبیلڵ فرۆش دەرفەت پەیا دەکات و خۆی لە دیوەخانەوە دەخاتە خوارەوە و هەڵدێ و بەرەو ڕێگای بانە دەڕوا. ژنی پاشا و جەماعەتێ لە سواران دەکەونە شوێنی. لە کەلی خان دەیدۆزنەوە، بەڵام دەبینن زەنبیڵ فرۆش دەچێتە ناو دڵی کێوکەو و خۆی دەشارێتەوە.

ژنی پاشا فەرمانی داوە لەو شوێنە بە سەر ئەو جێگایە، قەڵایەک دروست کەن تا بەڵکوو ڕێگای دەربازی نەبێت و ئیتر شوێنەواری ئەم زەنبیل فرۆشە نەبینراوە. ئەم قەڵا و سازگەی کە دروست کرابوو تا ئەم دواییانە هەر مابوون.

ئەم بەیتە چیرۆکێکی کۆنی کوردی یە، قارەمانی ئەم چیرۆکە لە هێندا "بودا"یە، لە فارسی دا "ئیبراهیمی ئەدهەمە" و لە کوردیدا "زەمبیل فرۆشە". کە ئەمانە لە سەرەتادا پادشا بوون، بەڵام لە بەر ترسی خودا و قەبر و زیندوو بوونەوە، بوونەتە سۆفی و گۆشەگیریان ڕەچاو کردووە، بەڵام زەنبیل فرۆش لە گەڵ سوفێگەری و گۆشەگیریدا بەینی نیە و ئەم جۆرە ژیانەی پێ خۆش نییە. چیرۆکەکە بە ئاواتی گەیشتنی خاتوون میری و زەمبیل فرۆش بە یەک، و هەر وەها زەمبیل فرۆش بە کۆشک و باخ و ماڵ و سامان کۆتایی هاتووە.

□

## بەیتی شێخ فەرخ و خاتوون ئەستێ

ئەم بەیتە سەرەتا لە قسەوە دەست پێ دەکا و زۆر بە کورتی باسی لە دایک بوونی فەرخمان بۆ دەگێڕێتەوە، پاشان دێتە سەر شێعری جوان و ڕەوان، کە بۆ دەربڕینی مەبەست جاری وایە نیوەی شێعرەکانی تەواو درێژن و جاری واشە زۆر کورتن، بەڵام لە هەموو حاڵێکدا کێش و مۆسیقا پارێزراوە و شێعرەکانی قافیەی هەیە.

**شێخ فەرخ کە خەیاڵی شاعیرێکی کوردی نەخوێندەوارە**، کاری لە کەشف و کەراماتی شێخانەدا نەهێشتووە و موعجیزاتی پێغەمبەرانەی کردوە. سەیر ئەمەیە بە پێچەوانەی پیاو چاکان بە باری خراپەدا کەڵکی لەو هێزە خواپێدراوە وەرگرتووە.

فەرخ هەر لە دایک دەبێت، وەک عیسا قسە دەکا. خەڵک سەریان سووڕ دەمێنێ و بە ڕموزی دەزانن. فەرخ لە قەرەواش و مامان و ژنەکانی دەور و بەری دایکی رادەخوڕێ و هەڕەشەیان لێ دەکا و تەنانەت لە هەڕەشەکانیدا وشەی بێگانە بە کار دێنێ، تا بزانن جگە لە زمانی زگماگی زمانی دیکەش دەزانێ، فەرقی فەرخی دەگەڵ عیسا دوو شتە، یەکیان عیسا کە بە ساوایی قسەی کرد، بۆ پاکانە کردن لە دایکی بوو، قسەکانی باش و خێر بوون و بەو موعجیزە مریەمی بۆختان پێکراو و ئابڕۆ براوی کردە، ژنێکی پاکی مێژوویی، بەڵام فەرخ زمانی بە باش و خێر نەگەڕا. جگە لەوەی هەڕەشەی لە خەڵک کرد، بەو زمانە تەڕ و پاراوە، دۆعا و نزای دایک و باوکە بەستە زمانەکەی خۆی کرد و کوشتنی. ئەوە یەکەم کاری باشی فەرخۆڵەیە. فەرقی دووهەم ئەوەیە، وەک دەزانن عیسا دڵداری و شتی وای نەکردووە تا لە سەر عەرزی بووە بە ڕەبەتی ماوە، بەڵام فەرخۆڵەی ئێمە هەر لە زگی دایکیدا ئاشقی خاتوون ئەستێی کچی مامی بووە، ودایک و باوکە هەژارەکەیشی بۆیە مراندوە تا بە کەیفی خۆی کا و لە خاتوون ئەستێ خۆشی ببینێ.

مامی فەرخی، ترسا خەبەر بە سوڵتانی ئەستەمبۆڵێ رابگا. کە رموزنەی وا لە بنەماڵەکەیان دا پەیدا بووە و ئازاریان بدا. دەستووری دا لە تەویلەی کەڵ و گامیشاندا فرێی بدەن تا لە بن پێیاندا تیا بچێ.

کە فەرخیان هاویشتە سەر لانک و بە دەسرازە توند توند شەتەکیان دا، کارێکی کرد کە بێ گۆمان لە مێژوودا وێنەی نیە و نەبیستراوە. دەسرازەی بە سەر خۆیدا فڕێ دەدا و لە لانکی دەهاتە خوارێ بە یەکجاری. بە سەرینی خاتوون ئەستێیە هەڵدەگەڕا، دەرزی لە بەرۆکی دەرهێنا، پێی دەیەخەی کێشا بۆ خۆی چووە نێو سینگ و مەمکانی بە یەک جاری.

لە پر رووداوێکی تازە روو دەدا، ئاشقێکی دیکە بۆ خاتوون ئەستێیە پەیدا دەبێ. "شێخاڵە کەچەڵ" قوت دەبێتەوە، گەورە پیاوێکی وڵاتی خۆیەتی، کەچی لە سوێی خاتوون ئەستێیە دەبێتە شوانی ماڵی باوکی. کەسێکی تر لە خێوەکە دەبێتە شێخاڵ، لە باتی شوانی داوای خاتوون ئەستێیە دەکا. براکانی و دایک و باوکی ناچار دەبن بە زۆرە ملی خاتوون ئەستێیە لە شێخاڵ مارە بکەن. بەو مەرجە شێخاڵە کەچەڵ تا مردن بۆیان بچێتە بەر مەڕ.

خاتوون ئەستێ نارازییە کە بێن، ئەو کارەی پێ خۆش نیە، بەڵام بە هۆی ماڵپەرستی و تەماح، کەس و کاری کچەکەیان ناچار کرد ئەو کارەی بکەن. ئەوان مەڕێکیان لە کچەکەیان پێ بە نرخ تر بوو، دەنا پێیان خۆش نەبوو شێخاڵ بێتە زاوایان. لەو نێوەدا تەنیا دوو کەس بە کەیف بوون، یەکیان شێخاڵە کەچەڵ و ئەوی تریان فەرخوڵەی دڵتەر.

فەرخوڵە گوێ ناداتە ئەوەی، گراویەکەی بە زۆری و بە نابەدڵی مێرد دەدەن. چونکە دەترسا یەکێ دی بە سەر خاتوون ئەستێ هەڵوەستێ و خاتوون بە بووک بچێ. بەڵام شێخاڵ زاوا بەندە و قەراریش وایە تا خاتوون ئەستێ بۆ خۆی مل نەدا، بە دەستی نەگرێ، کە وا بوو، جارێ فەرخ دەرفەتی هەیە کەیفی خۆی بە دۆستەکەی تەخت بکا.

ئەمەش بە هۆی ئەوە بوو کە پێیان خۆش بوو، خاتوون ئەستێ لە شوانێک مارە کەن، چونکە کورد لەو کاتەدا کۆچەر بوون و لە ڕێگای ئاژەڵداری مەڕ و ماڵات، ژیانیان دەبردە سەر.

بە دوای ئەوە شێخاڵ دەڵێت: دەبێ خاتوون ئەستێ، بێتە مەر دۆشین. لە گەڵ کیژانی دیکە دەچنە مەڕدۆشین، فەرخیش بێکار نیە و دەوری سەرەکی هەر ئەو دەیگێڕێ . کچەکان دەخەویی دەکەن و دەچنە شیو و کۆڵ. کە وەخەبەر دێ وە دوویان دەکەوێ. ئەوان خۆیان رووت کردوەتەوە و خەریکی کاری خۆیانن. فەرخ لە کەلێنی بەردی پاردەوە تەماشایان دەکات و چاو لە خاتوون ئەستێ و خۆشکەکانی دەکات. ئەم کارە ناحەزە بۆ ئەوەی سەرنجی خاتوون ئەستێ رابکێشێ، ئەنجام داوە. کارێکی سەیرتر دەکا، بەردان بە سەر خۆیدا دەڕوخێنێ و بە ئانقەست خۆی دەگەیەنێتە حاڵی جاوی. وسو ئاغا بانگ دەکەن یاسینی لە سەر بخوێنێ، بەڵام لە پڕ زیندوو دەبێتەوە نایەڵێ، وسوئاغا کە ئەویش دڵی بە خاتوون ئەستێوە هەیە، بێتە پێش. پاشان وسوئاغا دەکاتە نۆکەر و پیاوی خۆی.

خاتوون ئەستێ و دایکی بۆ دڵ دانەوەی شێخاڵ دەچنە مەڕی. فەرخ وەدوویان دەکەوێ. دایکی خاتون ئەستێ ناماقوڵی دەکا و هێستر وەسەر فەرخ دەپەرێنێ. فەرخ ڕقی لێ هەڵدەگرێ، دەپیشدا تۆلەیەکی لێ دەستێنێتەوە و کارێکی وا دەکا کە منداڵیش کاری وا ناکات. دڕک وەبن کلکی ئەو هێسترەوە دەبەستێ و پێرەژن سوار دەبێت و هێستر شیت دەبێ و پیرێژن بەم لاو ئەو لا دەبات و چی وانامێنێ ملی شکێنێ و فەرخ بەوەش رازی نابێت، دۆعای لێ دەکا و دەیکاتە بەردێکی شین. دیسان فەرخ ئیزنی داوە گورگ بە نێوان مەڕەکان بچن و گورگان دەنێرێ لە بەر چاوی شوانەکەی مامی، مەڕێ بخۆن بۆ ئەوەی هێزی خۆی بە شێخاڵ نیشان بدا. لە گەڕانەوەدا خاتوون ئەستێ زۆر لە فەرخ دەپارێتەوە دایکی نەجاتی بدات، بەڵام لە بەر دڵی ئەو، دەیکاتە دێڵە سەگ و

نایکاتەوە ئینسان. دوای ئەو ڕووداوە، ژنەکە بۆ کوڕەکانی دەگێڕێتەوە. ئەوان زۆریان پێ ناخۆش دەبێ و دەچن بۆ گیانی. ناچار فەرخ رادەکا و دەچێتە ماڵی وسووئاغا.

وسووئاغا زۆر ڕێزی لێ دەگرێ. لەوێش ئیعجازێک دەنوێنێ کە (شق القمر) وەبیر دەێنێتەوە. هێشتا ڕۆژی ماوە ڕەمەزان تەواو بێ. مامی رادەگەێنێ هەر کەس مزگینی جێژنم بۆ بێنێ، جوانە ئەسپێک و کاوڕێکی جێژنانە دەدەمێ. فەرخ زەمان دەگۆڕێ و جێژن سێ ڕۆژ وەپێش دەخات و مانگ دەبیندرێ و جێژنانە وەر دەگرێ.

لە هەمو سەیرتر دەسەڵات ڕۆیی ئینسانە، بە سەر تەبیعەتدا. کەس شتی وای لە دەس نەهاتووە. جگە لەوە تەنیا کارێکی قارەمانی چیرۆکەکەمانە کە قازانجی خۆی تێدایە و بە زیانی کەسیش تەواو نابێ.

کوڕەکانی مامی بە فێڵ خەریکن لە نێوی بەرن. خاتوون ئەستێ پێی دەزانێ و نایەڵێ لەو داوە کەوێ. فەرخ چیدی خۆی پێ ناگیرێ، دەپێشدا کارێکی گەڵێک خراپ و ئەرکێکی زۆر گەورە بە کوڕە مامەکانی دەکا. پاش ئەو کارە سواری جوانوولەی خۆی دەبێ و دەچێ بۆ شام بۆ ماڵی خاڵی. لە ڕێگادا تووشی زۆر کوێرەوەری دەبێ، بە سەر هەموو کۆسپێک دا زاڵ دەبێ. دیارە نەک بە هێزی شان و بازوو، بەڵکوو بە هێزی مەعنەوی. بەفر دەتوێنێتەوە بە زەحمەت لە زێ دەپەڕێتەوە، پیرە بارگینێک ئەسپەکەی بریندار دەکا، هەر چەند وایە، پەشیوان دەبێتەوە، فەرخ لێی نابوورێ و تووکی خراپی لە خۆی و تۆرمەی دەکا.

فەرخ ئەو جار ئیعجازی سولەیمان پێغەمبەر نیشان دەدا. زمانی باڵندان دەزانێ، لەو موعجیزەش کەڵکی خراپ وەردەگرێ، بەڵام دوایی پەشیوان دەبێتەوە و دۆعای باشیان بۆ دەکا. لە کەوانیش توورە دەبێ و دۆعای لە کەوانیش دەکا. دۆعاکەشی گیرا بووە. فەرخ گەیشتە شام و ماڵی خاڵی.

لە شام بازی شاهی لە سەر شانی دانیشت و بوو بە پادشا. فەرخ بە ئەمیری و مەزنی تەخت و بەختیش، خاتوون ئەستێی لە بیر نەچووە. دیسان بە شێوەی سولەیمان پێغەمبەر قاسیدی نارده کن خاتوون ئەستێ، بەڵام قاسیدی ئەو، باڵندەیەکی جوان و پاک و خاوێن بوو قورینگی جوان و نازدار بوو.

بە دوای ئەوە خاتوون ئەستێ دەچێتە شام و پاش ماوەیەک خاتوون ئەستێ دەگەڕێتەوە و دەمرێ و فەرخیش ئۆقرە ناگرێ و دێتەوە لای خۆی. کە دەزانێ خاتوون ئەستێ مردووە، دەچێ لە خودا داو دەکات یا بیکوژێ یا خاتوون ئەستێی بۆ زیندوو بکاتەوە.

**لە بارەی شێخ فەرخ:** مەزاری شێخ فەرخ لە گوندی «داودێ» لە ناوچەی پشدەرە. داودێ هەشت نۆ ماڵێک دەبێ، ٩ کیلۆمەتر لە شاری قەڵادزە دوورە. دەکەوێتە بەشی خوارووی ڕۆژهەڵاتی قەڵادزە.

مەزارەکە لە گۆڕەپانێک دایە و بەشی سەرووی شاخێکە و بەشی شیو و خڕ ودۆڵە تا دەگاتە چۆمی (مەرزەوانان) گومبەزێکی گەورە بۆ ئارامگاکەی کراوە، کە درێژی وارشەکە، نزیکی ٢٠٠٠ هەزار مەتر دەبێ و پانی نیو مەتر و بەرزی مەترێک دەبێ. ئارامگاکەی بە تاشە بەرد و کێلی گەورە دارێژراوە دەکەوێتە بەشی ڕۆژهەڵاتی داودێ.

دوادێ کانی و ئاوی زۆرە، بە ناو بانگ ترین کانی(کانی خاتوو ئەستێ) یە کە ئاوی خواردنەوەی قەڵادزە لەو کانییەوە بە بۆری ڕاکێشراوە و دەکرێتە تانکییەکی گەورە وە دوای ئەوە، دابەش دەکرێت.

گوندی دوادێ بە هۆی مەزاری شێخ فەرخەوە بووەتە سەیرانگا و کۆڕی شایی. بەهاران کەسێک نامێنێ نەچێتە داودێ و خەڵکی ڕاز و نیازی خۆیان لە گەڵ شێخ فەرخ دەکەن.

□

## بەیتی شێخ مەند و شێخ ڕەش

شێخ مەند و شێخ ڕەش ئامۆزا دەبن، شێخ مەند کەراماتدارە، باوکی لـە مـاڵ دەری دەکا و دەچێ بۆ شار. چاوەڕوان دەکرا بگاتە شـار، پلـە و پایـەی بچێتـە سەر. شێخ ڕەش ئەمەی پێ ناخۆشە. دەبـێ بـە مـارێکی ڕەش و دەچێتـە ژێـر تاتەبەردی نوێژ. شێخ مەند بە کەرامات پێدەزانێ. لە تاتـە بەردەکـە دەخـوڕێ، رێکی بکوشێ. شێخ ڕەش ناچار دەبێ بێتـە دەر. دێتـەدەر و دەبێتـە بـەرانێکی شین، شێخ مەندیش دەبێتە بەرانێکی زەرد. هەتا ئێواری بـە شـەر دێـن. شـێخ ڕەش چی بۆ ناچێتە سەر. لە شێخ مەند دەکەوێتە فێڵ. داوای لێـدەکا بـە رۆح بچێ لە بەهەشت قەندیلەی بۆ بێنێ. شێخ مەند بە رۆح دەڕوا. شێخ ڕەش قالبی بە جێ ماوی شێخ مەند بە خەنجـەر ئـاژن ئـاژن دەکـا. بـەمجۆرە شـێخ مەنـد دەکوژرێ. شێخ ڕەش لە ترسی تۆڵە، خـۆ لـە پـشتی ڕۆژ حەشـار دەدا. خـوێن ئەستینانی شێخ مەند کە ئەمە دەزانن، کۆڕی زیکر دەبەستن. شێخ ڕەش گوێی لێ دەبێ بۆ بینینی کۆڕی زیکر سـەر کـل دەکـا. ئـەوانیش لـەم هەلـە کەڵـک وەردەگرن و بە تیشکی نیگا دەیسووتێنن.

□

## بەیتی عەبدوڕەحمان پاشای بابان

ئەم بەیتە کە لە لایەن مامۆستای نەمر و زانا، شایەری هەرە گـەورەی کـورد، عەلی بەردە شانی بۆ عەبدوڕەحمانی پاشای بابانی هەڵگوتووە، شـاکارێکی کـەم وێنە و دوڕی سەر خەزێنەی بەیتە جوانەکانی کوردییە.

عەلی بەردە شانی دەڵێ:

پاشـــای بـــەبان جیهـــانگیری وەک رۆســـتەمی زاڵـــی پـــیری

ناکـــەم خزمـــەتی وەزیـــری نـــانی دەســـتێنم بـــە شـــیری

تـــەحا بـــەڕاو و تـــەگبیری

□

## بەیتی عەبدوڵلا خان

ئەم بەیتە، کارەساتی کـوژرانی عـەبباس ئاغـای دێبـوکری و جـەماوەرێ لـە هاورێکانی عەبباس ئاغایە لە مەهاباد،کە بە دەستی عەبدوڵلا خان موکری ساڵی ١٢٥٦ی کۆچی مانگی رووی داوە.

ئەم بەیتە لە لایەن مامۆستا قادر فەتتاحی قازی کۆ کراوەتەوە و لە کـولیجی ئەدەبیاتی علومی ئینسانی زانستگای تەورێز چاپ کراوە.

□

## بەیتی عەزیز و کوبرا

هەوشار شوێنی رووداوی ئەم بەیتەیە، عەزیز و کوبرا کـوڕ و کچـە هـەژارێکی ئەم ناوچەیە کە دەبنە هەوێنی ئەم بەیتە، سەرەتا لە لایـەن کەسـێک بـە نـاوی "سـەیید شـوکرە"ی کـەریم ئـاواوە دانـراوە و پاشـان "سـەیید عـەبباس" ی سەفاخانەی هەوشار بە شێوەیەکی رێک و پێک تر دای رشـتووە. مێـژووی ئـەو رووداوە، دەگەرێتـەوە بـۆ سـەرەتای زسـتانی ١٣٤٩ی هـەتاوی کـە کـاک حەمەدەمینی دژبان خەڵکی سـاری قۆرخـان هـاوڕێی عـەزیز کـە لـە نزیکـەوە ئاگاداری رووداوە بووە، ئاوامان بۆ دەدوێ:

عەزیز و کوبرا دەستگیرانی یـەک بـوون، پـاش شـەش مانـگ بـاوکی کـوبرا پەشیمان دەبێتەوە و دەڵێ لە گەڵ ماڵی عەزیز ژن بە ژنە ناکەم. ئـەوانیش کـە بە راستی ئەویندارى یەکتر بوون، شەوێکی سـەرەتای ساڵـی ١٣٤٩ ی هـەتاوی چووکەڵە کوچێکی بۆ دەکەن و هەر لەو شەوەدا سەرما و بەفر و بـاران سـەریان لێ دەشوێنێ و کوبرا رەق هەڵدێ و عـەزیزیش لـە دوای چەنـد رۆژێـک خـۆی دەکوژێ.

قەبری عەزیز لە ئاوایی"خار خارە" و قەبری کوبراش لە ئاوایی"گویا غاج"ە.

بەیتەکە ئاوا دەست پێدەکا:

ئەوەڵ بە ئیسـمی زاتی موتـەدەس    خودای ئێمەکان ئاگی فـەریاد رەس

هەر مەوجوودێک بێ لە خاس‌وخراو ئاسمان و زەوی بەڕی بێ یان ئاو

□

## بەیتی عەلی عاشق

دەگێڕنەوە زەمانی زوو لە ئاوەداینێکی ئەم کوردستانە دا، لاوێک ژیاوە کە ناوی عەلی بووە. عەلی گیرۆدەی داوی ئەوینی کچی مەلای ئاوایی بووە. مەلازادەی شۆخ و شەنگیش دڵی بە عەلی‌یەوە بووە. ئەوینی ئەو کوڕ و کچە وەک ئەوینی لەیلی و مەجنوون و مەم و زین، ئەوینێکی پاک و خاوێن و ئاسمانی و دوور لە هەواو و هەوەس بووە. خوازبێنی کاری ناردۆتە سەر کیژی مەلا، بەڵام شۆفار و دوو زمان و ریاباز کە هەمیشە بوون و وا زووش بنەبڕ نابن، چوون دەکەلیشەی مامۆستاوە و نەیانهێشتووە کچەکەی بداتێ و پێیان سەلماندوە **"مەلا زادە بۆ بۆرە پیاو نابێ"**.

کوڕی سەوداسەر وەک قەیسی عامیری لە سوێی گراوی یەکەی کە بە داخەوە ناوی نازانین، شێت دەبێ و ئاوەدانی بە جێ دێڵێ و دەس رەکێوان دەدا. و بە چەقالە، بەڵالووکە کێویلکە، گوێژ و کرۆسک و گیا و گوڵی کوێستانان ژیاوە. جار و بار شوان و گاوان نانی ڕەقیان بە خێری خۆیان داوەتێ، چەند ماوەتەوە روون نیە. کچە مەلاش هەموو حاڵی دنیای لە خۆی حەرام کردووە و قەت لە ژوور نەهاتۆتە دەرێ و کەسی نەدواندوە و شەو و ڕۆژ گریاوە.

مەلای موسڵمانی کورد، زگی پێیان سووتاوە و بەزەیی پێدا هاتوون و کچەکەی بە زۆرە ملی نەداوە بە کوڕی ئاغا یا کوڕە مەلا یەکی وەک خۆی، یا بازرگانێکی دەوڵەمەندی شار، بۆ خۆی وەبەندەیان کەوتووە و عەلی ئیتر بە "عەلی عاشق" ناو بانگی رۆییوە بە هەزار زەحمەت دۆزیویەتەوە و دڵخۆشی داوەتەوە و بەڵێنی داوەتێ چیدی بە قسەی دوو زمان و شۆفاران نەکا و کچەکەی بداتێ.

عەلی عاشق هاتۆتەوە ئاوەدانی، مەلا نوشتەی بۆ نووسیوە، دایکی سەری لە پلاو و گۆشتی گرتووە، دەستە براکانی دەورەیان داوە و قسەی خۆشیان بۆ کردووە تا وریا بووەتەوە و هۆشی هاتووەتە سەر خۆ. مەلاش بۆ خۆی کچەکەی لێ مارە کردووە و بە جل و بەرگ و جیازی خۆی بۆی سوار کردووە. سواری کورد رمبازیان لە پێش کردووە. دەستە خۆشکەکانی سەمایان لە پێش کردووە، دایکی زاوا و پیرێژنەکان ئاوێنەیان بەرەو رووی راگرتووە، بەر بووک سواری ئەسپی بارگە بووە، خزم و کەس و کاری پیاوی عەلی لە سەر بانەوە شاباشیان بە سەردا هەڵاویشتووە، منداڵ تێک وەروو کەوتوون و شاباش و نۆقڵ و نەباتیان کۆ کردۆتەوە، بووکیان لە سەر کورسی دابەزاندووە دوو برازاوا پێلیان گرتووە و بەرەو پەردوویان بردووە. کە دەگاتە ئێرە شادی مەرگ دەبێ و گیانی پاکی بە خودا دەسپێرێ و لە بەر دەرکی پەردوو دەکەوێ.

□

## بەیتی قەر و گوڵە زەر

بەیتێکی ئاشقانەیە، کوڕە قزلباشێکی ئێرانی ئاشقی کچە کوردی ئەو دیوی سنوور بووە. ئەم رووداوە پاش دابەش کردنی کوردستان لە نێوان سەفەوی و عوسمانیەکان دا قەوماوە.

لەم بەیتەدا شتێکی زۆر گرنگ ئەوەیە، کە کچە شوانێکی کورد زۆر دژوار بووە لە گەڵ کوڕی پیاوێکی گەورەی قزلباش زەماوەند بکا و هەر وەها قزلباشەکەش نەیوێراوە بووکێ لەو دیوی سنوور بگوێزێتەوەوە بۆ ئێران. لەم لاشەوە بازرگانێکی گەورە بە ناوی "بەکر شێخان" کە هاتوچووی هەر دووبەشان دەکا و کاروانی پێشی ناگەڕێتەوە، عاشق و شەیدای **"خاتوون گوڵەزەر"** دەبێت و بە کوڕە قزلباشەکە دەڵێ: کە چلۆن کوڕە شوانێک ئەتوانێ کچی "حەمەدی پاشاخان" بێنێ، بەڵام کە زانی کوڕە قزلباشەکە بۆ خۆی حاکمی سندووسە و ئەتوانێ رێگای ئەو دیوسنی لێ ببەستێ و سەرمایەکەی لە کاویتە مەترسیەوە،

نەک هەر دەس لە خاتوون گوڵەزەر هەڵدەگرێ، بەڵکو دەبێتە دەڵاڵ و نێو بژی کەریش. قسەی قەری بۆ گوڵەزەر بردوە و قاقەزی بۆ قەر هێناوە.

ئەم دڵدارییە خەریک بووە نێوانی دوو وڵات بشەوێنێ و شا عەبباس و سوڵتانی عوسمانی بە کژ یەکدا بچن. شا بە فەرەجوڵلاخانی باوکی قەر ئەم مەبەستە رادەگەێنێ و فەرەجوڵلا خان لە کوڕەکەی حاشا دەکا کە هۆی ناخۆشی سوڵتان و شا پێک بێنێ. لە دوایی دا مەعلوم نیە چارەنووسی قەرە و گوڵە زەر چبووە. بەیتەکە بە نیوە چلی دەبڕێتەوە.

□

## بەیتی قوچ عوسمان

ئەم بەیتە لە کاتی دەسەڵاتداری عوسمانیەکان و کەم هێز بوونی دەربەگایەتی نێو خۆ رویداوە. ئەمیرێکی کورد(میرسەیفەددین) ئەسپێکی باشی بووە، سوڵتان داوای ئەسپەکەی ئەکا کە بۆی بنێرێ و ئەمیریش بە پێچەوانەی ئەمری ئەو، ئەسپەکەی نەداوەتێ و سوڵتان لەم رووداوە رقی هەڵساوە.

سوڵتان کە زانی بە ئاسانی ناتوانێ وە چەنگی خات، کەوتە فڕوفێڵ و سوێند و قورئان خواردن،ئەمیری کورد فریوی سوڵتانی عوسمانی خواردوە و چووەتە ئەستەمبووڵ. کە گەیشتە ئەوێ، ئەسپەکەی لێ دەستێنن و بە نامەردی میر سەیفەددین دەکوژن و قوچ عوسمانیش کە ناهێڵێ پاشا سواری ئەسپەکەی بێت دەکوژرێت. لەم بەیتە شایەر زۆر قسە بە پاشای عوسمانی گوتووە و زۆر دابی کۆمەڵایەتی کوردەواری باس کردوە.

□

## بەیتی کاکە میر و کاکە شێخ

بەیتەکە شینی دوو خۆشکە بۆ براکانی، کە ئەو کارەساتە بە کورتی لە لاپەڕەی ٥٢٣ی شەرەفنامەی کوردیدا نووسراوە. بە قسەی شەرەفخان ئەم رووداوە لە ساڵی ١٩٤١ی زایینی روویداوە.

□

## بەیتی لاس و خەزاڵ

ئەم بەیتە، بەیتێکی یەکجار کۆنی ئەدەبی کوردییە و باسی لاوێک بە ناوی لاس و کیژێک بە ناوی خەزاڵ دەکات.

لاس دارێکی سەخت و دڕۆکاوییە و دیارە ئینسانی ئەو وەختە کە لە جێگایەکی سەخت و ناهەموار و ئەشکەوتا ژیاون، ئەم ناوەیان بۆ کوڕیان هەڵبژاردوە. ڕەنگە ئەو بەیتە بۆ زەمانێک دەگەڕێتەوە کە ژنان لە حکوومەتدا دەسەڵاتیان بووە و بە چەشنێک هەر وەک ئەوەی کە فیردوسی لە شانامەیدا لە دەوری ساسانیان باسی لێ کردوە، وەک:

مەزنایەتی لە خێزانێکدا نامێنێ     کە مریشک وەک کەڵەشێر بخوێنێ

بەڵام بە پێچەوانەی ئەوەی کە دوو کوڕ لە سەر کیژێک شەڕ و هەرا ئەکەن، لەم بەیتە دا دوو کچی کورد، دڵیان لە پێناوی کوڕێک داناوە و بە سەر هاتی ئەم چیرۆکەیان خولقاندووە.

باری دڵداری بەیتی لاس و خەزاڵ، زۆر شیرین و جوان و تەواوە. پاش ئەوەی خەزاڵ لاسی داگیر کرد ئێزنی داوە بێتە عەشیرەتی خۆیان، بەڵام ئەم پێی وت کە سوێند بخوا کە لە گەڵ خانزاد قسە نەکەیت و لەبزت لە گەڵی نەگەڕێ.

هەر چەن خانزاد زۆر خێر و خێراتی بۆ کرد و روو خۆشی لە گەڵیا نیشاندا، بەڵام لاس نە تەنیا قسەیشی لە گەڵ نەکرد، بەڵکوو زۆر بە نامەردی باسی ئەکات. هەر بەم هۆیەوە خانزاد، دۆعای لێی ئەکات. لاس بە دوای هەواو هەوەسی خەزاڵدا دەڕۆا بۆ چڵ پلەی عومانێ.

لەم سەفەرە پڕ لە مەترسی یەدا، خەزاڵ شوێنی لاس دەکەوێ و بریندار دەبێت و کاتێک خەزاڵ، لاس دەدۆزێتەوە، دەبینێ لاس مردوە و لەم کاتەدا خەزاڵ شینی بۆ دەگێڕێ

□

## بەیتی لەشکری

"لەشکری" شایەر و خۆشخوانی سلێمان بەگی قولی بەگ بووە. گیرۆدەی ئەوینی خانزاد، شێرەژنی مێژوویی گەلی کورد بووە، ئەوین هانی داوە خەیانەت بە ئاغای خۆی بکات. جاسووسەکانی سوڵتانی ئەستەمبوول بەڵێنیان داوەتێ ئەگەر سولەیمان بەگ دەرمان خوارد بکا خانزادی لێ مارە بکەن. ئەویش ژەهری بۆ سلێمان بەگ لە قاوە کردووە و کووشتوویەتی. خیانەتەکە ئاشکرا بووە، خانزاد "لەشکری" لە چینەی دیواری گرتووە، دەڵێن لەشکری ئەو بەیتەی لەو حاڵەدا گوتووە. خانزاد لەوێ راوەستاوە و گوێی بۆ هەڵخستووە تا تەواو بووە. ئەو جار بە دەستی خۆی تۆپێکی قوڕی بە دەمی داوە.

**بەسەرهاتی بەیتی لەشکری:**

لە "پارێزگای هەریر" لە نێوان شاری ڕەواندز و شەقڵاوە دا شارێکی بچکۆلانە هەیە، پێی ئەوترێ (هەریر) کە ئەم شارەیش پێتەختی میرنشینێک بووە، لەو میر نشینانە کە لە ناوچەی کوردەواریدا دامەزرا بوون و پێی وتراوە"**میر نشینی سۆران**".

بە بروای مێژوونووسان نزیکەی ٤٠٠ ساڵ لەمەو بەر، میرێک فەرمانڕەوایی میرنشینی سۆرانی دەکرد کە بە ئازایەتی و زیرەکی و خۆشەویستی زانست و دادپەروەری ناو بانگی دەرکرد و ئەویش "سلێمان بەگ" بوو. ئەم سلێمان بەگە لە هەڵسووڕانی کارو باری میرنشینەکەدا متمانەیەکی زۆری بە "خاتوو خانزاد" ی خۆشکی دەکرد. چونکو خاتوو خانزاد زیرەک و چالاک و دڵگەرم دەبێ و شەو و ڕۆژیش لە پێناوی بەرژەوەندی دانیشتوانی میرنشینەکەیدا، تێدەکۆشا و شان بە شانی میر سلێمان بەگی برای هەوڵی دەدا بۆ هەراو کردنەوەی وڵاتی سۆران و دەسەڵاتیان لە میرەکانی دەوروبەر دەستاندوە یان دەیانهێنایە ژێر ڕکێفی خۆیان. هەتا ڕۆژێکیان سلێمان بەگ لەگەڵ "لەشکری" ناوێک کە سەر

کردەی سوپاکەی دەبێ بۆ دیدەنی والی تورک دەچێتە بەغدا، لەشکری منداڵ بووە کە باوکی کۆچی دوایی دەکا. میر سلێمان دەیگرێتە خۆی و بە هەتیوی بەخێوی دەکا کە گەورەیش دەبێ، دەیکا بە سوپا سالاری سوپاکەی خۆی. لەشکری دڵی بەوە خۆش کردبوو کە دوای سلێمان بەگ ببێ بە میر و بۆ خۆی میرنشینی سۆران بگرێتە دەست. بۆیەش بە نهێنی لە گەڵ والی تورک کۆبونەوەیەکی کرد و زمانی لە دژی سلێمان بەگ خستە کار و گەلێک بوختانی ناڕەواشی دایە پاڵی. تەنانەت وای لە والی کرد دڵی لە میر سلێمان کرمێ ببێ و مەترسی لێ بکا. لە بەر ئەوە، والی داوای لە نۆکەرەکەی خۆی کرد کە ژەهر بکاتە قاوەکەی سلێمان بەگ و ئەویش دەست بە جێ فرمایشتەکەی والی زۆرداری، جێ بە جێ کرد. تا بەم جۆرە میر سلێمان بە ناهەق کوژرا و وڵاتی سۆران بە سەر خاتوو خانزاد مایەوە.

لەشکری بەدفەڕ، بەو ئومێدە والی یارمەتی بدا و بیکا بە میری سۆران لە بەغدا مایەوە، بەڵام خاتوو خانزاد کە هەواڵی چۆنیەتی کوشتنی برای و ناپاکی "لەشکری" سپڵەی لە پیاوێکی سلێمان بەگەوە پێدەگا، نووسراوێکی جوان و رازاوە، بۆ لەشکری دەنێرێ و داوای گەڕانەوەی لێدەکا و بەڵێنی پێدەدا کە خاتوو "ئایشێ"ی خێزانی جوانەمەرگ سلێمان بەگی برای، کە زۆر جوان و رەوشت بەرز دەبێ، لێ مارە بکا و زووش بۆی بگویزێتەوە. هەر وەها خاتوو خانزاد لە نووسراوەکەدا، بلێنی ئەوەشی دەداتێ کە لە گەڵ گەیشتنەوەی بۆ "هەریر" بیکا بە میری سۆران و جلەوی کارو باری بداتە دەست.

"لەشکری" ناپەسەند بەم هەموو بەڵێنە خۆشانە زوو دەستەخڕۆ بوو و کۆچ و کۆچباری ئامادە کرد و بەو هیوایە ببێ بە میری سۆران و خاتوو "ئایشێ" ی نەرم و نۆلیش بگرێتە باوەش، گەڕایەوە بۆ هەریر و خۆی خستە داوی خاتووخانزادی دلێرەوە. دیارە خەیاڵی خاو بوو، چونکە کە گەیشتە هەریر، خاتوو خانزاد گرتی و دایە دادگا و لە پاداشی ئەو ناپاکی یەی کە لە گەڵ سلێمان بەگی بێ گوناح دا

کردبووی، فەرمانی کوشتنی دا و فەرمانەکەشی زوو جێ بە جێ کراو لەشکری بە مورادی خۆی نەگەیی.

لە پاشان خاتوو خانزاد خۆی فەرمانڕەوایی میرنشینی سۆرانی گرتەوە دەست و پەیوەندی لە گەڵ دەوڵەتی عوسمانی کە ئەوساکە وڵاتی لە ژێر رکێفدا بوو، پچڕی.

خاتوو خانزاد، ماوەیەک فەرمانڕەوایی میرنشینی سۆرانی کرد و بەرامبەر بە دانیشتوان دڵنەرم و پر بەزەیی و لە رووی دوژمنیش سەر سەخت بوو. خاتوو خانزاد لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا کە فەرمانڕەوا بووە، دەستی بووژاندنەوەی بۆ ئاوەدان کردنەوەی زۆر لا درێژ کردووە. گەلێ ڕێگا و بان و پرد و قەڵای سەخت سەختی دروست کردووە کە تا ئێستاش شوێنەواری ئەو قەڵایانەی لە ناوچەکانی باڵەک و بانەمان و سەرووی هەریرەوە دروستی کرد بوون، هەر ماوەتەوە.

قەڵای هەریر زۆر گەورە و بە نیو بانگ و سەخت بووە، دیوارەکانیشی لە جێی خۆی ماوە و تا ئێستاش بە ناوی "قەڵای خاتوو خانزادی سۆران" ناو دەبرێن و خو دەنوێنن و گەواهی دەدەن کە خاتوو خانزاد شێرەژنێکی بە ناوی بانگی کورد بووە.

هەتا خانزاد، خانزاد بوو — خانزادی سۆران، میر بوو
میری دەشتی، هەریر بوو — ئاوی رووباری، شیر بوو

خاتوو خانزاد جگە لەمانەش بایەخی زۆری بە زانست داوە و خەڵکی لەم پێناوەدا هانداوە و زانایانی لە هەندەرانەوە هێناوە، هەتا دانیشتوانی سۆران شتیان لێ فێر بن و لەمەش پتر هەمیشە باوەشی بۆ فەقیر و هەژار کردۆتەوە. وەک دەڵێن: لە دوای کوژرانی میر سلێمان بەگ خاتوو خانزادی سۆران شێرەژن و زانست پەروەر ناردوویە لە حەسەنئاوای ئەردەڵان (سنە) زانای بەناوبانگ مەلا حەیدەری باپیر گەورەی بنەماڵەی حەیدەری ماوەران و لە

هەولێر و بەغدا، مەلا ئەبوبەکری باپیری گەورەی مەلا گچکەی کۆیە و مەلا ئەفەندی و مەلا ئەبوبەکری هەولێری و ئەحمەدی ئەفەندی ئەعیان کە هەر دووکیان کانی فەزڵ و هونەر و زانستی کوردستانن، هێناویەتە خاکی سۆران و مەلا حەیدەری لە هەریر و مەلا ئەبوبەکری لە هەولێر دامەزراندوە، بە هۆی ئەو دوو گەورە زانای کوردە، عیلم پەرەی سەندووە و ئێستاش زانین لەو وڵاتەدا هەر بەردەوامە.

□

## بەیتی مەحمەڵ و برایمی دەشتیان

خاتوون پەریخانی کچی میرزۆراب خان، لە شاری "**چەلیان**" حوکمەت دەکا. کەیفی بە پیاوان زۆر هەڵدەستێ. هەر پیاوێک داوای ئەو رەد بکاتەوە دەیکوژێ. مەحمەڵ مەرِدارێکی قورسە لە ئەشکەوتی "بێشوە"ی، بە هەڵکەوت تووشی برایم دێ و بە کار دەیگرێ. وردە وردە نێوانیان ئەوەندە خۆش دەبێ دەیکا بە برا گەورەی خۆی. برایم نیاز دەکا ژن بۆ مەحمەڵ بخوازێ. جەلە قەشەنگەکانی دەخاتە پێش، هەتا لە شاری چەلیان بیانفرۆشێ. مەحمەڵ تووشی خاتوون پەریخان دێ و داوای ئەو بە جێ دێنێ، بەڵێنی خواستنیشی پێدەدا، برایم کە ئاگاداری ئاکامی ئەو گەرداوە هەیە، دەزانێ درکاندنی باسی سەرە، بە مەحمەڵ دەڵێ: تەنیا رِێگا ئەوەیە پەریخان هەڵگرین و وڵات بە جێ بێڵین. هەر واش دەکەن. پاش ساڵێک، غوربەتی، مەحمەڵ لاساری دەکا و بۆ گەرِانەوە بیانوو دەگرێ.

برایم ناچار مل دەنێ و دەگەرِێتەوە، زۆر زوو قاو لە وڵات دەگەرِێ. لەشکریان دەگاتە سەر برایم و مەحمەڵ، شوێنێکی ئاستەم بۆ شەر هەڵدەبژێرن. لەشکر کوشتە و بریندارى زۆر دەدەن، بەڵام زەفەریان پێ نابەن، مەحمەڵ تیرو کەوان تورِ هەڵدەدا و بە شیری رووت روو دەکاتە شەرِگە!

دوای شەرێکی خەست دەکوژرێ. برایم لێیان دێتە دەست و کوڕ و چەند پیاو ماقوولی خان دەکوژێ و خۆشی دەکوژرێ. میر ئەمر دەکا خاتوون پەریخان بکووژن. کەیخودا و ردێن سپی، ئامانی پەریخان بۆ دەخوازن. میر لێی دەبوورێ، بەڵام دەستوور دەدا هەتا ماوە دەبێ وەک قەرەواشێک لە متبەغدا بژی. پەریخان کە حامیلە بوو، دوو کوڕی بە زگێک دەبێ، نێویان دەنێ برایم و مەحمەڵ.

برایم و مەحمەڵ گەورە دەبن، ئاگاداری چۆنیەتی مەرگی باوک و مامیان دەکرێن. بە تۆڵەی ئەوان میرزۆرابی باپیریان دەکوژن و دایکیان دەکەنەوە حاکمی شاری چەلیان.

**روانینێکی تر بۆ بەیتی مەحمەڵ و برایمی دەشتیان**

بەیتەکە باسی کچە ئەمیرێکە کە خۆی بە ئەستۆی شوانێکدا بڕیوە. باوکی ئەم کچە ناوی "میر زوراب خان" خۆی پیر بووە، نەیتوانیوە پادشایەتی بکا. کوڕەکەشی بچووک بوو و کاروباری مەزنایەتی و پاشایەتی بە خاتوون پەریخانی کچی ئەسپاردووە.

بەڵام پەریخان سەڕەرای ئەوەی کە پاشایەکی نەترس و ئازا بووە، تووشی نەخۆشینی جینسی بووە کە هیچ پیاوێک نیتوانیوە رازی بکات و لە دوای کام وەرگرتن بە هۆی نەخۆشی و نارەزایی دەیانی کوشت و دیسوتاندن.

جا هەر ڕۆژێک یەکێکی وەژوور دەخست و دیسوتاند تا نۆبە بە شوانێک گەیشت خۆی بە ئەستۆی دابڕیوە و دەستی لە خەڵک سوتاندن هەڵگرتووە.

میرزوراب کە ئاگای لە کاری کچەکەی دەبێت و زانیویەکە کیژەکەی لە گەڵ کوڕە شوانێک دڵداری ئەکات، لەشکری هێناوەتە سەر برایم و مەحمەڵان.

بە دوای ئەوە کۆتایی بەیتەکە ئەمەیە، کە کوڕی مەحمەڵ و خاتوون پەریخان میر زوراب خان دەکوژن و دایکیان دەکەنەوە پاشا و بەم جۆرە ئاکامی ئەو، پاشا کوژرانە، بە دەستی ئەو کوڕە بووە.

□

## بەیتی محەممەد حەنیفە

بەیتی محەممەد حەنیفە بەیتێکی ئایینی یە. حاجی قادری کۆیی لە بارەی بەیتی محەممەد حەنیفە دا فەرموویەتی:

وەک"**محەممەدحەنیفە**"بەیتی مەتین نییە ئیلا حیساری قوستەنتین

□

## بەیتی ناسر و ماڵ ماڵ

بەیتی ناسر و ماڵ ماڵ، بەیتێکی رەوان و دڵداری و حەماسی یە. ئەم بەیتە زۆر کۆن نیە و لە مەڵبەندی کوێستانی"گاگەش" لە کوردستانی ئێران، لە مەڵبەندی مەنگوڕان، لە نێوان سەردەشت و مەهاباد دا هەڵکەوتووە.

قەبری ناسر و ماڵ ماڵ لە نێوان گوندی "گاگەش" و "شەکر بەک" هەر کامیان لە گردێکی بچووک ئێستاکەش هەر ماون. لە چیرۆکی بەیتەکە دەرئەکەوێ کە لە کاتی دابەشکردنی کوردستان و بێ دەسەڵاتی دەربەگایەتی ناوخۆیی، لە کوردستاندا رویداوە.

ئەم بەیتە لە لایەن ڕەحمان بەکرەوە بۆ ئوسکارمان نووسەری ئاڵمانی گێڕاوەتەوە.

□

## بەیتی ئەحمەدی شەنگ

خانی گێلان خۆشکی ئەحمەدی شەنگ رادەکێشێ، کوڕێکی لێ دەبێ، زەمان رادەبرێ و کوڕە گەورە دەبێت. دوژمنایەتی خان و ئەحمەدی شەنگ ناکوژێتەوە، ڕۆژێ لە ڕۆژان، خان بە ماڵی ئەحمەدی شەنگ دادەدا، سەری گاوان دەبرێ و گاڕان بە تاڵان دەبا. ئەحمەدی شەنگ بە تاقە سوارەوە دەچێ سەری تاڵان بگێڕێتەوە، پیاوانی یەک بە یەک لە خوانی زێڕین دەگلێنێ، تەنیا نۆکەرێک و خۆشکەزاکەی دەمێنێتەوە، ئەم نۆکەرە، بە پێ و قەدەمی

ئەسپەکەی دەبەخشێ و بەزەیی بە خۆشکەزاکەی دا دێ و دەیهاوێتە پاشتەرکی خۆی و سەری تالان دەگێڕێتەوە، خۆشکەزا هەڵدەکێشێتەوە.خۆشکەزاکەی بە چەک و لە پشتەوە، خاڵ (ئەحمەدی شەنگ) دەکوژێ.

□

## بەیتی باپیر ئاغای مەنگوڕ بابی هەمزە ئاغا

یەکێک لە کارەساتە دڵتەزێنەکانی مێژووی کوردستان پاش موکری قڕانەکەی شاعەبباسی سەفەوی، کارەساتی قەتڵ و عام کردنی عەشیرەتی مەنگووڕە لە مەراغە، خانەکانی موکری کە لە مێژەوە لە سەر موکریاندا دەسەڵاتیان بووە و بە هۆی بوداغ سوڵتان کە ئەمیرێکی دادپەروەر و عادڵ بووە، زۆر ڕێزیان لێ گیراوە و لە ئاوەدانی سابڵاخیش زۆرێ تێکۆشاوە کە شوێنەوارەکانی شایەتی ئەم مەسەلەن، وەک پردی سوور و مزگەوتی سوور و کۆخی کورتەک، کە ئێستاش هەر ماون لە دەستگردی ئەو ئینسانە مەزن و پیاو چاکەن. لە زەمانی مەزنایەتی ئەودا، موکریان سەربەخۆ بووە و هیچ بێگانەیەک نە عوسمانی و نە سەوفەوی پێدا را نەبردون. سککەی بۆ خۆی لێ داوە و کوڕەکانی خۆی فێری هونەر کردون. بەردە نووسراوەکەی سەر دەرکی مزگەوتی سوور کە لە ساڵی ۱۰۸۹ ی کۆچی دا سوهراب خانی کوڕی هەڵی کەندوە، ئەم حەقیقەتە دەسەلمێنێ.

بەڵام بە داخەوە ئەو بنەماڵەش پیاوی گەندیان لێ پەیدا بوو، خەڵک لە دەستیان وەڕەز بوو. باپیر ئاغای مەنگووڕ کە پیاوێکی بە دەسەڵات و مەزنێکی ئازا و لێهاتوو بوو خەریک بووە حوکمەت لە دەس ئەو بنەماڵەیە وەدەر بێنێ. پێیان زانیوە، بەڵام نەیان وێراوە بە گژی دا بچن پەنایان بۆ بێگانە بۆ شای ئێران بردووە. ئەویش ئەحمەد خانی موقەددەم حاکمی مەراغە، کە لە مێژەوە دوژمنایەتی دەگەڵ خانەکانی موکری دا بووە، کردۆتە مەئمووری کوشتنی باپیر ئاغای مەنگوڕ. ئەحمەد خان فێڵی لە باپیر ئاغا کردووە، بانگ هێشتنی کردوە بۆ

مەراغە. باپیر ئاغاش بە خۆی و نۆسەد سواری هەڵبژاردوی مـەنگوڕەوە چووەتـە ئەو شارە. سوارەکانیان بە سەر ماڵان دا بڕیون. لە شەوێکی دیاری کراو دا هـەر کەس میوانی خۆی لە خەوێدا سەر بڕیوە. لەو نۆ سـەد سـوارە، تـەنیا سـۆارێک دەرچووە کە ناوی وەستا عوسمان بووە. دەڵێن عەشـیرەتی مـەنگوڕ پـاش ئـەو کارەساتە پیاویان لێ بڕاوە، وەستا عوسمان ژن و منداڵی باپیر ئاغای دەرکـردوە و ماڵ و دەوڵەتی هەموو عەشیرەتەکەش بە تاڵان چووە.

هەمزە ئاغای مەنگوڕ کە پیاوێکی شۆڕشگێر و بە ناو بانگە و نیزیکەی سـەد و چەند ساڵ لەمەو پێش لە راپەڕینی رزگاریخۆازانەی شێخ عوبەیدوڵلای نەهریـدا بەشداری کردوە، کوڕی باپیر ئاغای مەنگوڕە. زۆر شتی سـەیر و قارەمانانـە لـەو پیاوە دەگێڕنەوە. پاش تێک شکانی جووڵانەوە ناکامەکەی "شێخ هەمزە ئاغا"ش بە دەستی حاکمی کوردی ساباڵخ "ئەمیر نیزامی گەرووسـی" دیـسان بـە فـێڵ وەک باوکی کوژراوە، ئەمیر نیزامی پیاو کوژ و خوێن ڕێژ کە خـۆی نووسـەرێکی باش بووە لە کتێبێکدا باسی کوژرانی هەمزە ئاغای مەنگوڕی بە قەڵـەمی خـۆی نووسیوە.

باپیر ئاغا کە کوژراوە، تەنیا کـوڕێکی ژن و منداڵـی هـەبووە، بۆیـە جگـە لـە بەرەی خدری، بەرەکانی دیکـەی مـەنگوڕان هـەموو بـە نـاوی دایکیانـەوە نـاو دەبرێن. بەرەی دێرێنی، بەرەی شەمێ، بـەرەی زێـنی، بـەرەی مرۆتـێ، بـەرەی ئامانی.

دەڵێن ئەم بەیتەش عەلی بەردە شانی داینـاوە چونکـە بەیتەکـە زۆر رەوان، ساکار و جۆان گوتراوە، بەڵام لەم بەیتە دا ناوی هیچ شایەرێک نەهاتـە گـۆڕێ و روون نیە کە بەیتەکە عەلی بەردەشانی دایناب‌ێ، کە مامۆستا هێمنیش لـە سـەر ئەم قسە و باسە سوورە و بە هۆیەک ئەمەی سەلماندووە کە هـی عـەلی بـەردە شانی یە و هی ڕەحمان بەکر نیە.

## بەیتی چێری

یەکێک لەو بەیتانە، بەیتێکی کۆنە بە ناوی"چێری" کە باسی گەورە شارێک دەکا هەر بەو ناوە. لەو بەیتە دا کوڕە پاشایەک بە ناوی "چێری" کە ئاشقی کچی مامی خۆی بە ناوی"فەرەنتی" دەبێ دەست بە ساز کردنی شارێک لە مەڵبەندی شارویرانی ئێستادا دەکا تا گراویەکەی تێیدا بژی و خۆش رابوێرێ.

*فەرەنتی: بەردێکی بە قیمەتە، وەک یاقووت و زومورود، ئێستاش لە کوردستاندا ئەو ناوە لە کچان دەنێن.*

□

## بەیتی سەیدەوان

"**عەبدولعەزیزی داسنی**" سێ کوڕی دەبێ بە ناوەکانی "**سەیدەوان**"، "**نێچیروان**" و "**مەلکەوان**". سێ کوڕی گەنج کە کاتی ژن هێنانیانە و سێ بووکیان بە ڕۆژێک بۆ دێنن. عەشیرەتی داسنی هەموو لە شایی و زەماوەنددا بەشدارن. "مەلکەوان" شەوی هەوەڵ پەردوو گیر دەبێ و دەمرێ و خەفەتێکی گەورە دەخاتە سەر دڵی باوکی، بەڵام عەبدولعەزیز کوڕە سەرۆکی عیلی داسنی؛ چۆن ڕووی هەیە بە عەشیرەتەکەی بڵێ؟

دەستی دیلان بەردەن و بڵاوەی کەن!

ڕاستە کە کوڕ مردن پشت شکێن و بڕست بڕە، بەڵام ئەی سەرۆکی چی، ئەی پیاوەتی و میوان خۆشەویستی چی لێ بکا؟

عەبدولعەزیز دەنگ ناکا و هەڵپەرکێ و زەماوەند هەر دەمێنێ. تا شەوی دووهەم دەشتەوانان هەواڵی دەدەنێ کە "نیچیروان" لە ڕەوەزە بەردی تووش و چڕ، هەڵدێراوە و مردووە. دیسانەوە باوکی کۆست کەوتوو برینی دەکۆڵێتەوە و خەم بە هەموو گرانی یەکەوە، دەکەوێتە سەر دڵی و بیر دەکاتەوە، دوو کوڕی جوانە مەرگ بوون. ئەم زەماوەندە شوومە، ئەم بەهارە بێ فەر و دزێوە چی بکا، ئایا لە گەڵ ئەوەشدا، تەرمی دوو کوڕی لاوی لە بەر دەستە، زەماوەند هەر

بمێنیٚ؟ ئەگەر من بە داسنی یان بڵێم من زەماوەنـد نـاگێرم، ئێـوە هەڵـپەڕکێ بوەستێنن، چی پێدەڵێن؟

ئـاخۆ ناڵـێن عەبدولعـەزیز پـیرە خـەرفاوە، پیـاوێکی ئـاخر شـەڕە؟ ئەمانـە ژێردەستی خۆین، بێ جیاوازی، کوڕە داسنی کـوڕی ئـەون و هـەموو ئـەوڕۆ لـە شادی ئەودا بەشداران، میوانن. گەڕی هەڵپەرکێ گەرمە، کیژ و کـوڕی داسـنی خەریکی روێنە و سوێسکەیی و چۆپی و سێ جـادن، ئـاخۆ بچێتـە ناویـان و بـە پڕمەی گریانەوە بڵێ، ئەی کوڕ و کیژی داسنی دیلانەکەتان بـەردەن، لـە بـاتی شایی شین بگێڕن. مەلکەوان و نێچیروان مردون و ئێـوە بـۆ دوو زاوای مـردوو، سەما و شایی دەکەن. بەڵام نا عەبدولعەزیز کوردە، ئەوانـەش میـوانن، رەوا نیـە زەماوەندکەیان بشێوێ. ئەی دڵی پەژارەی چـی لـێ بکـا، ئـەم هـەموو خـەم و دەردە بۆ کوێ بەرێ؟ وا باشە لە ئاوایی دەرکەوێ، پەنا بەرێتە بەر داوێـنی چیـا، خەفەتی بدا بە دەم شەماڵی سەر شێتی شین و دۆعا! با لە هەرای هەڵـپەڕکێ رزگار بێ. ئاگری دەروونی بە جۆش دێ و دەیبا تا ئەو جێگایە وا رێبازی مـەڕ و بزنە کێوی یە لە ژێر بەردێک ئارام دەگرێ، بەڵام دڵی وەک ئـاوی سـەر ئـاگری بەتین دەجۆشێ و هەڵدەچێ. فرمێسکی گەرمی بە سەر گۆنای پر چینیدا دێتە خوار.

دەوروبەری بەهارە، بەڵام چ بەهارێک؟ بەهارێکی ڕەش و ناحەز. ناحـەزتر لـە هەموو زستانێک، چاوی تیژی وەک هەڵـۆی پـیری چیـا دەڕوانێتـە ئـەو بـەری دولەکە. بەهانەی لە ماڵ دەرکەوتن و کۆڕی زەماوەند جێ هێشتنی، ئەمەیە کە دەچێ گۆشتی راوێک بێنێتەوە. لێرە دایە کە تراژدی دەگاتە ئەو پـەری خـۆی. دەستێکی بە هێز لە کار دایە بۆ پەروەراندنی دڵتەزین ترین بە سەر هات.

دەوروبەری بەهار، گیا شینە، لاسکی ناسکی گوڵی کێوی بە دەم بای نـەرم و نیانەوە دەلەرێتەوە. دڵی باوکێک پڕ لە مەینـەت. پـەردەی زاوایـی دوو کـوڕی گەنج بە تاڵە دوو بووک چاوەڕوان، داسـنی لـە شـایی و خۆشـیدا نـوقم بـوون.

عەبدولعەزیز گاهێ بە دڵیدا دێ، دوانم مردن "سەیدەوان"م ماوە، ژیان ماتەمە یا شینە؟

دەنگی گۆرانی بێژ و دەهۆڵ و زۆرنای نێو دێ کە زۆر دوور لـە دەرەوە دێتـە بەر گوێ، ئەو جار، نەوای شەماڵ دەیهێنێ. دەڵێ ژیان شایی یە "دەوران مردن" هەموو دەمرن، چونکە لە هەوەڵەوە نەبوون، هاتن و پاشان ڕۆیشتن.

کەوایە ژیان قوناغێکی کەم خایەن و کورتە، لە نێوان دوو نەبوونی درێژ و بـێ بەستێدا.

هەرا و بگرێکە بەینی دوو بێدەنگی و هـەدا دان کـە وەهایـە شـایی یـە، بـۆ نەمانی بێدەنگی ماوە زۆرە، بەڵام دۆڵی کڕ و خامۆش کە دەڵـێی گریـانێکی بـە کوڵی پیاوانەیە لە گەرودا بەستراوە دەڵێ ... نا ... ژیان ماتەمە. ژیـان کۆسـت کەوتنە. ژیان لە گۆ کەوتنی دوو لێوی پڕ بزەیە. با لەو بەری دۆڵەکەوە یاری بـە مـووی ریـشی زەردی بزنــە کێـوی یـەک دەکـا. لێکـی دەدا. دەیهۆنێتـەوە. عەبدولعەزیز بە چاوێکەوە کە فرمێسکی مەینـەتی تێـزاوە دەڕوانێتـە ئـەو مـووە زەردانە کە دەڵێی پرچی گوڵە بەڕۆژە یا قژی گەنمە کانەیە و با دەیشەکێنێ، وا دەزانێ بە ڕاستی مووی ریشی بزنە کێوی یە. تەقەی تفەنگ هەڵدەسـتێ وەک پرمەی گریانێکی بە کوڵ دەچێ. نا دەڵێی قاقای پر لە تەوسی ئینسانە بە ژیان. شتێکی زیندوو لـە پـشت بەردێکـەوە دەکەوێتـە خـوارەوە. وا دیـارە پێکـراوە. عەبدولعەزیز دەگاتە سەری دەبینێ "سەیدەوانە". مووی زەرد و خوێنی سـوور و دەم و چاوی سپی لە سەر گیای سەوز تێکەڵ بوون. هەناسە لە سـینگی چیـادا قەتیس ماوە. کەو لە قاسـپە کـەوتووە. ڕۆژ خـۆی لـە ژێـر هـەورێکی چـڵکندا شاردۆتەوە.

عەبدولعەزیز چی بۆ ماوەتـەوە، دانیـشتنێ چونکـو ئـەژنۆی هێـزی نیـە. لـە بێدەنگی دەترسێ و ناشتوانێ بگری چونکوو پەشۆکاوە، هەموو دونیا لە بەرچاوی دەبێتە یەک پرسیار، ژیان شینە یا شایی یە؟

خەم لەوە گەورەترە کە لە دڵی پیر و ناسکی عەبدولعەزیزدا جێگای بێتـەوە، دەپارێتەوە. لە بەر خەم لە خودا دەپارێتەوە"رەبی خودایە بای رەحمـەتێ بێنـێ لە لای قیبلەی موبـارەک". چەنـد خـەمێکی گەورەیـە خـەمی عەبدولعـەزیزی داسنی کە دوو کوڕی دەمرن و یەکێکی خۆی دەیکوژێ. لە کاتێکدا زەماوەندە، بەهارە، کاتی بووژانەوە و ژیانەوە. بەیت بێژ چ تراژدی یەکی بەرزی پێک هێناوە گیانی نەمری شاد بێ.

**وڵاتی داسنی: کەوتوتە بەری بارزان جێگایـەکی چـڕ و ئەسـتەمە کەوتۆتـە نێوەڕاستی تورکیا و عێراق. بزنە کێوی زۆری لێیە و جێگە راوە.**

□

## بەیتی سیسەبانێ

لە ناو فەرهەنگ و ئەدەبی کرمانجی دا، "بەیت" بەشێکی حاشا لێ نـەکراوە و جێگای تایبەتی هەیە. یانی مرۆڤ دەتوانێ بێژێ کە یەکێک لـە لایەنـە کـۆن و گرینگەکانی فۆلکلۆری کوردی پێـک دێنـێ کـە بـە مانـەوەی ئـەو، زانیـاری و فەرهەنگی کرمانجیش دەوڵەمەند بووە و ساغ ماوەتەوە. ئەدەبی سـەر زارەکـی (ئەدەبیاتی شەفاهی) بەم بەیت و سترانانە لە لایەن بەیت بێژ وگۆرانی بێژانـەوە، پارێزراون و هەر ئەو بەیت و سترانانە لە قەدیمەوە لە سەر زاری منداڵ و گەوران بووە و کورد لە منداڵی یەوە ئەوانەیان لە بەر بووە و بە دەنگ و ئاواز لـە کـات و ساتی ژیان و جێگا و ڕێگای ژیاندا گوتوویانـە و تێیـان چریکانـدووە، بەڵـام لـەو رەوەندەدا، هەندێک لەم بەیتانە لە بیر چوونەتـەوە و بەشـی زۆری ئـەو بەیتانـە، بەکەم و کەسری لە ناو میللەتدا ماونەتەوە.

لە نێو ئەم بەیت و باوە جۆراوجۆرانەدا، بابەتی مێژوویی، ئـایینی، ئەوینـداری، پیاو چاکی و کۆمەڵایەتی دێنە بەرچاو، شـێوەی ژیـان و تێفکـرینی کۆمـەڵ لـە ڕۆژانی ژیندا و لە جێگای ژیاندا دەخەنە بەرچاوی مرۆڤ.

بەیتی "سیسەبانێ"ش لەو بەیتانەیە کە ڕووداوێکی کۆنی ئایینی دێنێتەوە بیری مرۆڤ ئەویش چلۆنایەتی شەڕێکە لە نێوان موسڵمان و فەڵەدا لە "**دۆڵی سیسەبانێ**" یان "**سیسەجانێ**" دا. هەر چەند لە مێژووی شەڕەکانی ئیسلامی دا ئاماژەیەک بەو شتە نەکراوە، بەڵام لە کتێبی "**دیوانی کرمانجی**" نووسینی "**عەبدوڕەقیب یوسف**" دا هاتووەکە:

نەزیلەی سیسەبانێ، چیرۆکێکی مێژوویی یە، لە بارەی شەڕی ئەسحابەکان پێغەمبەر(د.خ) و فەلاکان. ئەویش لە دۆڵی سیسەبانێ کە سەحابە، گەڵێک شپرزە بوون و شکاون هەتا ئیمامی عەلی(د.خ) هاتووە و لەشکری دوژمنی تێک شکاندووە.

□

## بەیتی شۆڕ مەحموود و مەڕزینگان

کابرایەک بووە ناوی **مامەڕەش** بوو. سەرداری عێڵ بوو، (جهانگیر بەگیان پێ دەگوت). مامەڕەش کچێکی بوو، بە ناوی **مەڕزینگان**.

براکەشی کوڕێکی بوو بە ناوی **شۆڕ مەحموود**. ڕۆژێکی براکەی بە مامە ڕەشی گوت: براله، با ئەو کچ و کوڕە لە یەکتر مارە بکەین، ئامۆزان، بۆ یەکتری چاکن. مەڕزینگانیان لە شۆڕ مەحموود مارە کرد.

برای جهانگیربەگ کاتێ مرد، شۆڕ مەحموود حەوت ساڵانە بوو، بە ئەمری خودا هێندە بچووک بوو کاری لەوەدا نەبوو، بەڵام مامەکەی خۆشی نەدەویست، دەیگوت: دەست لە من دەستێنێ، دەسەڵاتم لە چنگ دەردێنێ. شۆڕ مەحموود کە گەورە بوو، هێندە ئازا و نەترس بوو کەس نەیدەوێرا سەری لە بەر هەڵێنێ. ڕۆژێک لە ڕۆژان بە مامەکەی گوت: مامە ئەو کچە لە من مارە کراوە، نایدەی بیگوێزمەوە؟

مامە ڕەش کەیخودای بانگ کرد، گوتی: ئەو کـوڕە داوای مـەڕزینگان دەکـا، نامەوێ بیدەمێ. ئەگەر ئەو کچەم لێ بستێنێ بێ شک دڵم دەتۆقێ. هێنـدەش ڕەشیدە ناوێرم بڵێم ناتدەمێ، چارە و تەگبیرم چییە؟

گوتیان: دوو پشت بەرلە ئێوە، حاکمەتی تورک و تورکومان بە دەسـتی ئێـوە بوو. ئێستاش تایفەی ئێوە یـەکێکی لـێ هەڵـکەوتووە، وەکـوو شـۆر مـەحموود بینێرە سـەر تـورک و تورکومـان بێـستێنێتەوە. ئـەو جـار ئەگـەر بـەڕێت کـرد تەگبیرێکی بۆ دەکەینەوە.

مامەڕەش ناردی بە شوێن شۆڕ مەحموود و بانگی کرد. شـۆڕ مـەحموود کـە هاتە ژوورێ، مامەڕەش لە رانی خۆی داو گوتی: رۆڵـە ئـەو کچـە مـارە کـراوی خۆتە، بەڵام داخێکم لە دڵ دایە! شۆڕمەحموود گوتی: مامە بۆ لە رانی خۆت دا، چ حەسرەتێکت لە دڵ دایە؟ گوتی: رۆڵە حاکمەتی تورک و تورکمان هـەر هـی ئێمە بووە، بەڵام ئێستا پیاوی وامان نەماوە ڕێی و شوێنی قەدیممان بۆ جـێ بـە جێ بکاتەوە. وا چاکە بچی حاکمەتی تورک و تورکومان بستێنی یەوە و پاشـان مەڕزینگان بگوێزەوە.

مامەڕەش فریوی دەدا، بۆ تورک و تورکومـانی دەنێـرا. شـۆڕمەحموود پێـی گـوت: مامـە ئـەتۆ هـیچ قەباڵـە یـەکت هەیـە؟ مامـە ڕەش گـوتی: دەفتـەری سلسیلەی تایفەم بۆ بێنە. کاتێـک شـۆڕ مـەحموود دەفتەرەکـەی هێنـا و بـۆی خوێندەوە، دیتی دوو پشت بەر لەوان خەرج و باجی تـورک و تورکومـان بـەوان گەیشتووە. شۆڕ مەحموود ئەندازەی حەوسەت سـواری سـاز کـرد، خەبـەری دا تورک و تورکومان، ئەگەر بۆم بە جێ دێڵن چاکە، دەنا کەللە پەڕین دەبن.

□

## بەیتی قەڵای دمدم

ئەحمەد خان برادۆست ناسراو بە "**ئەحمەد خانی لـەپ زێـڕین**" لـە زەمـانی شاعەبباسی سەفەویدا [illegible] بوو و لە یەکێک لە [illegible]ەکانی [illegible]ی بەرانبـەر بـە

شاعەبباس راوەستاوە، شا عەبباس توانی بە هۆی لەشکری زۆر کە لە ئیسفەهانەوە بۆ سەر ئەحمەد خان ناردبووی، تێکی شکێنێ و خان ئەحمەد خان هەڵات بۆ ئەستەمبووڵ و چووە کن پاشای عوسمانی.

لە شەڕێک لە گەڵ رووسەکان ئەویش بەشدار بووە دەستی پەڕی و بە دوای ئەو شەڕە پادشای عوسمانیش دەستی زێڕی بۆ دروست کرد و لەو کاتەوە بە ئەحمەد خانی لەپ زێڕین ناو نرا. بە هۆی ئازایەتی و چالاکی نواندنی، ئەحمەد خان بۆ وڵاتی خۆی ناردراوە و لە ورمێ و دەوروبەری بە ئەمیری ئەو ناوچانە هەڵبژێردرا، بەڵام دوای ماوەیەک عێل و عەشیرەی لە دەوری خۆی کۆ کردووەوە و بەرانبەر بە شا عەبباس سەرکەشی کرد. شا عەبباس خۆی بە جلی دەرویشیەوە رۆیشتە ناو قەڵای دمدم و ماوەیەک وەک کرێکار لە دروست کردنی قەڵاکە ئیشی کرد تا بە دزی خان ئەحمەد خان گەڕایەوە بۆ ئیسفەهان و لەشکر و سوپای خۆی ئامادە پەلامار بۆ سەر قەڵای دمدم کرد.

هەر چەن خان ئەحمەد خان قاسیدێکی بۆ یارمەتی بۆ لای عەشیرەکانی دیکە نارد بوو، بەڵام قاسید بە هۆی هیلاکی لە کاتی گەڕانەوەی لە ڕێگا خەوی لێ کەوت و لەشکری خان ئەحمەد خان نامەی قاسیدەکەیان گۆڕی و بە خوێن نووسیان کە عەشیرەتەکان گوتویانە: حەوت ساڵی دیکە یارمەتی تۆ ئەدەین.

خان ئەحمەد خان کە ئەم ماوەی زۆر پێ سەیر بووە بە ناچاری لە قەڵا هاتە دەر و هێزی خان ئەحمەد خان بە هۆی برسیەتی، تینویەتی و کەم بوونی هێزەکانی بەرانبەر بە لەشکری شا عەبباس، نەیانتوانی بەرەنگاری بکەن و هەمووی پێشمەرگەکانی و خان ئەحمەد خانیش لەم شەڕە دا کوژران و بنەماڵەی و خەڵکی ناو قەڵاکە بە دیل گیران و شتەکانیان لە ناو چوو یان بە تاڵان بران.

**لە کتێبی توحفەی موزەفەرییە ئوسکارمان ئاوا باسی قەڵای دمدمی کردووە:**

ئەم بەیتە چیرۆکێکی ئەفسانەیی یە کە لە قەڵای دمدم رووی داوە. ئەم بەیتە بە سەر هاتی ئەمیر خانی برادۆست کە ئاڵا هەڵگری سەر بە خۆیی کوردستان بووە و بە شا عەبباس ئەم زاڵم و خوێن رێژە دەڵێ: ئەگەر تۆ شایت، منیش خانم و لە بەر ئەمە لەشکری شا عەبباس پەلاماری ئەمیر خانی داوە و لە قەڵای دمدم دا بە قڕ و تینووی دەیکوژێ. لەم کاتەدا پاشای عوسمانیش هیچ لە سەری نەکردوەتەوە و شا عەبباس بە ئاسانی توانی ئەمیر خانی لەپ زێڕین بکوژێ. کە لەو کاتەدا ئەسکەندەر بەگی تورکمان (خاوەنی کتێبی عالەم ئارای عەبباسی) فەرماندەری لەشکری شا عەبباس بووە.

**بەسەرهاتی کوژرانی ئەمیر خانی برادۆست و گرتنی قەڵای دمدم:**

ئەمیر خانی برادۆست بە هاوکاری جەماوەرێکی زۆر لە خەڵکی عەشیرەی برادۆست لە پەنای ورمێ دا، قەڵایەکی قورس و قایمی ساز کرد کە قەڵاکە لە پێنج جێگە دروست کرا بوو. جێگای کانیاوی لێ بووە و ئاوی خواردەمەنی بۆ خۆیان و وڵاغەکانیان لێ تەرخان کرا بوو. کە گومبەزێکی لە سەرا دروست کردبوو و پێیان دەگوت: "سولق" و لە لایەکی ترەوە بۆ پاراستنی حەوزەکە بورجێکیان بە پاڵ قەڵا کەوە هەڵچنیبو. لە لای باشوورەوە سەهۆڵ دانێکیان دروست کرد بوو کە لە زستاندا بە بەفر و سەهۆڵ داخندرێ و لە تەنیشت ئاو، حەوزێک هەیە تا بەفر و سەهولێک کە دەتاوێتەوە، بچێتە ناو ئەم حەوزە کە بە جێگای ئەمەیشیان گوتووە: "بوزلق" یا "قارلق".

یەکێکی دیکە ئەسڵی قەڵاکە بووە، ئەوی دیکە قەڵای خوارێ بووە و شوێنێکی تر، بورجی گەورەی دەرەوەی درگای ڕۆژهەڵات بووە.

هەر چەن لە کاتی دروست کردنی ئەم قەڵایە، پێشگیری لێ کرا و قسەیان بۆ کرد کە بە هەبوونی قەڵای تەورێز و ئێرەوان پێویستی ئەم قەڵا نیە، بەڵام ئەمیر خانی برادۆست گوێی نەدا و ئەم قەڵای بە شکۆیەکی خاسەوە دروست کرد. تەنانەت "پیربوداق خانیش" کە بۆ گەیاندنی قسەی شا بە ئەمیر خان تا

نزیک قەڵاکە رویشتبوو، بە دەستی برادۆستیەکان کوژرا و لە لایەکی تریشەوە خان ئەبداڵی موکری برای شێخ حەیدەر کە لە دەستی شا یاغی بوو، لە ترسی هێزی شا چووە لای ئەمیر خانی برادۆست و ئەمیر خان پەنای پێدا و ئەم دژایەتیە پەرەی سەند.

لەشکری شا عەبباس بە تەواوی هێزەوە و بە بەشداری چەک و کەرەسەی نیزامی و بە سەرۆکایەتی حەسەن خان، جەماوەرێکی زۆر لە پیاوانی جەلالی و گەورەکانی قزلباش، هێرشیان بۆ سەر قەڵای دمدم هێنا و لە دەوری قەڵا، هوردویان هەڵدا. پێشنیاری پارەیان بە ئەمیرخانی برادۆست دا کە لە شەڕ دەست هەڵگرێ و لاساری نەکات، بەڵام ئەمیرخان بە قسەی نەکردن.

لەم کاتەدا (اعتمادالدولە) لە ئەردەوێڵەوە هاتە تەورێز و لە گەڵ تفگەنچیەکانی ئیسفەهانی، خوراسانی و تەورێز و باقی بەرەو قەڵای دمدم وەرێ کەوت و لە رێگاشدا زۆر ئاغا و خان و خەڵکی دیکەش کەوتنە تەکی و بەرەو قەڵا ئەمیر خان وەرێ کەوتن. اعتماد الدولە بەڵینی دا بە ئەمیر خان کە ئەگەر خۆیان بدەن بە دەستەوە هیچیان پێ نەڵێ و بەر عەفووی شا کەون، بەڵام ئەم کەڕەتەش ئەمیر ئەم داخۆازی رەد کردەوە.

شەڕ بە گەرمی لە چەند لاوە دەستی پێکرد و لە لایەکی دیکەشەوە دەیانویست ئاوی قەڵاکە ببستن و تا رادەیەک توانیان ئەم کارە بکەن و ماوەی دە پازدە ڕۆژ لە ئاوی بوزلق کە ئاوی باران بوو، دەیان خواردەوە و ئاوی بۆگەنی حەوزەکەش بەشیانی نەدەکرد.

تا ئەوەی ئەم قەڵایە سەرەڕای خۆراگریێکی زۆر لە لایەن کوردەکانەوە، گیرا و ئەمیر خانی لەپ زێڕین (برادۆست) و جەماوەرێ زۆر لە هاوڕێکانی کوژران، یان بە دیل گیران.

□

## بەیتی مەم و زین

مەم و زین بە ناو بانگترین چیرۆکی کوردییە. چیرۆکی مەم و زین هەر بە کوردی نەماوەتەوە. تا ئێستا، بە زمانەکانی ئاڵمانی، فەڕانسەوی، رووسی، ئەرمەنی و تورکی وەرگێڕاوە. لە ساڵی ١٣٤١ی کۆچی (١٩٦٢ی ز) ئەم بەیتی مەم و زینە، بە دەستی کاک عوبەیدوڵلا ئەییوبیان هاتۆتە سەر رێنوسی کوردی وبە فارسی زۆر باسیشی کراوە کە چاپیش کراوە.

سەرەڕای کۆنی بەیتی مەم و زین، نیشانەی ئایینی زەردەشتی بە ئاشکرایی پێوە دیارە و ئەویش بەڵگەی کۆن بوونی ئەم چیرۆکەیە. "خانی" نەمر شاعیری مەزن و پایەبەرزی کورد، ژیانی هەتا هەتایی دا بە چیرۆکی مەم و زین، شاکارێکی دروست کرد تا دنیا دنیایە مایەی شانازی کورد بێت. ئەم بەیتە ئێستاش هەم بە شێوەی بۆتانی و هەم بە شێوەی موکریانی هەر ماوە.

پیرەمێردی نەمر شاعیر و ڕۆژنامە نووسی هاوچەرخیش مەم و زینی هەیە، مەم و زینی پیرەمێرد ئیبداعێکی خۆیەتی و زۆرلە بەیتە کۆنەکە دورە. چیرۆکێکی شانۆیی باوی ڕۆژ بووە. تەنانەت بەرەو ئەدەبی ڕۆژئاوایی چووە و وەک دراماکانی شکسپێر دەچێ.

مەم و زینی پیرەمێرد بە نۆرەی خۆی پارچەیەکی ئەدەبی کۆمەڵایەتی بەرزە. بە زمانێکی شاعیرانە و هونەرمەندانە ڕەخنەی لەو ڕەسمە کۆن و دزێوەی کوردەواری گرتووە کە کچان بە زۆرە ملی دەمرێنن و دڵی دڵداران دەشکێنن و ئێستاش لەگەڵ سەردەمی حازریش فەرقێکی زۆری نەکردوە، بەڵام بابەتێکی نوێ و لاساکردنەوەیێکی ڕۆژئاواییە کە لەگەڵ رێ و شوێنی کۆنی کوردەواری، یەک ناگرنەوە و زۆر لە بەیتەکەش دوور بووەتەوە.

زین هەم لە بەیتەکەدا و هەم لە مەم و زینی خانی دا بە مردنی خۆی لە سوێی مەم مردووە و ئەوەش سۆزی ئەوین و وەفای پتر تێدایە. کە چی زینی

پیرەمێرد خۆی دەکوژێ. قەدیم خۆ کوشتن لە کوردەواریدا نەبووە، ئەو دیاردەیەمان زۆر لە مێژینە نیە لە ڕۆژئاواوە پێگەیشتووە.

هەژار شاعیری بە ناو بانگ و هاوچەرخیش، مەم و زینی هەر لە سەر کێشی مەم و زینی خانی بە شێوەی موکریانی کردۆتە شێعر، شێعرەکانی گەلێک سوار و لە بار و پاراو لە بەرچاون. چیرۆکە کەشی هەر وەک خانی دارشتووە و پەروەردەی کردوە و سەری گرتووە.

بەیتی مەم و زین لە لایەن ئوسکارمان نووسەری ئالمانی کە رەحمان بەکر بە چوارڕۆژ بۆی گوتووە و ئەویش نووسیویەتی و دایناوە، هەندێک جیاوازیان لە گەڵ ئەحمەدی خانی هەیە، بەڵام خانی بە راستی ئەم دیدارەی زۆر ئاسایی پێک هێناوە و لە واقیعی نزیک کردۆتەوە.

**لێکۆلینەوەی زیاتر سەبارەت بە بەیتی مەم و زین:**

مەم تاقە کوڕی برایم پاشایە، لە سێوی بەهەشتی خولقاوە، زین و مەم ئاشقی یەکتر دەبن. مەم بە دوای زین دا عەودالی جزیر و بۆتان دەبێ، تووشی بە تووشی قەرەواشی زین، واتا "مەلەک رێحانی کچی بەکر" دێ، مەلەک رێحان پێی دەڵێ: ئەگەر دەتەوێ بە موراد بگەی روو بکەنە مالی "کا بەکری"، واتا مالە بابی مەلەک رێحان. ئەگەر پیاوەتیت دەوێ روو بکە مالە قەرەتاژدینی (زاوای کاکەی زین)، مەم لە گەڵ "بەنگینی" هاواڵ و نۆکەری خۆی، روو دەکاتە مالە بەکر، بەڵام چۆن دەبێ کەس لێیان دەرناکەوێ. ئەوانیش رێگای مالی قەڕەتاژدین دەگرنە بەر. "قەڕەتاژەدین" زاوای میر زیندینی برای زینە. پای مەم بۆ بارەگای میر زیندین دەگرێتەوە. مەم زۆر زوو لە دلی میردا جێ دەگرێ. خۆشەویستی ئەو دەگاتە رادەیەک، سێ جار زینی پێشکەش دەکا، بەڵام ئەو قەبوولی ناکا! چونکوو بەکر بە هۆی شۆفاران بە درۆ پێی گەیاند بوو زین گول بووە!

مەم دوایی کە بەم حاڵە دەزانێ، زۆر پەرۆش دەبێ، زینیش هەر وەها، ڕۆژێک کە میرزیندین دەچێتە راو، مەم بارەگا دەکا بە جێ ژوان! ئەم دیدارە تا هاتنەوەی میر دەخایەنێ، قەرەتاژدین بۆ رزگاری مەم لەم گەرداوە،ماڵی خۆی ئاور تێبەر دەدا و هەتا میر لە کوشک و بارەگا دوور بخاتەوە. بەکر دوایی میر ئاگادار دەکا ئەم سووتمانە بۆ چی بووە. میر و بەکر پیلانی لە ناو بردنی مەم دادەڕێژن. قەرەتاژدین و لایەنگرانی مەم بە بیانووی باج و خەراج لە جزیر دوور دەخەنەوەو بە دزی، مەم دەخەنە زیندانێکی قووڵ. دەمە دەمی مەرگ، زین پێدەزانێ مەم لە سەر کۆشی ئەو دەمرێ.

بە دوای ئەودا، زینیش دڵی دەتۆقێ، میر دەستوور دەدا هەر دووان لە پەنای یەک بنێژن. قەبر شەقەیان تێدەکەوێ.

بەکر روو دەکاتە میر و دەڵێ لە قەبریش دا لە کوڵ خۆشکت نابێتەوە، میر ئەمر دەکا بەکر هەر لەوێ بکوژن. چەند دڵۆپ لە خوێنی بەکر دەکەوێتە نێوان هەر دوو قەبرەکە، دڕکی لێدەڕوێ و دەبێ بە دڕووی مەم و زینان.

لە بەیتی مەم و زینی خانیدا مەم و تاژدین دوو کەسایەتی مەزنی چیرۆکی مەم و زینی ئەحمەدی خانیە، کە لە یەکێ لە جێژنەکانی سەری ساڵدا (نەورۆز) لە کوردستان دا روویداوە.

لەم کاتەدا مەم و زین کە دوو دڵداری یەک بوون پێکەوە ژیانی هاوبەشیان دەست پێ دەکەن، بەڵام بە هۆی بەدخۆازان، مەم زیندان دەکرێ و لە زیندان دەمرێ و زینیش پاش ماوەیەک لە سەر گۆڕەکەی مەم کۆچی دوایی دەکات و بەرەو لای دەڕوا.

مەم و زین تراژدیێکی خەمناکە کە تێدا باسی ژیان و بە سەر هاتی کوردی لە باکووری کوردستان یانی تورکیا کردووە کەئەو کات لە ژێر زوڵمی ناڕەوای عوسمانیەکان بوو.

## پیتی ئ

**حەزرەتی ئەبوبەکر:** قینم لەو خاوەنماڵانەیە، کە خۆراکی چەندرۆژێک، لە یەک ڕۆژدا خەرج ئەکەن.

**حەزرەتی ئەبوبەکری سەدیق:** بەراستی خودا برێ لەو کارانە کە ئەبێ لە شەودا بکرێ قەبولی ناکا بە ڕۆژدا بکرێ، وە هەروەها وەرناگرێ ئەو عەمەلە کە هی ڕۆژە، لە شەودا بکرێ ... هەر بەو جۆرە تا فەرز نەکەی، سوننەتت لێ قەبوڵ ناکات.

**حەزرەتی ئەبووبەکرسەدیق:** کەسێ بچێتە ناو گۆڕ بێ تۆشە، وەکو کەسێ وایە بچێتە ناو دەریاوە بێ کەشتی.

**ئیمام شافیعی:** قازی ئەگەر بە حەوسەلە و فرووتەن نەبوو، دزە.

**ئیمام شافیعی:** ریشە و بناغەی هەموو دوژمنی‌یەک، چاکە کردنە لەگەڵ مرۆڤی سپڵە و درۆزن و بێ وەفادا.

**ئەنیشتێن و چارلی چاپلین:** ڕۆژێ ئەنیشتێن بە چارلی هەڵکەوتووی سینەمای گوت: ئەوەی کە هۆی ناوداری تۆ لە ناو خەڵکدا بووە، ئەوەیە کە تۆ بە جۆرێ خاس ڕێگە ڕویشتنو، قسەی خۆت ئەگەێنی.

چارلیش لە وەڵامدا وتی: بە پێچەوانەی من، تۆ بە هۆی ئەوە ناودار بویت، کە زۆربەی قسەکانت خەڵک لێی تێ ناگەن.

**ئەفلاتوون:** دونیا وەک نووسراوەیەکی خودا وایە، هەرکەس ئەم نووسراوە جوانتر بخوێنێتەوە، زیاتر بە گەورەیی خودا دەزانێ.

**ئەفلاتوون:** دادگەری واتە ڕاگرتنی میانەڕەوی و حەقانیەت لە هەرشت و هەر جێیەکدا.

**ئەفلاتون:** هەر کەس بۆ بەختەوەری و خۆشبەختی خەڵک هەوڵ بدا، بۆ خۆشی بە بەختەوەری دەگا.

**ئەفلاتوون:** کەم تاقەتی و خۆڕانەگری، نەک هەر باری مەینەت و زەحمەت لە سەر شانی کەسێ سووک ناکا، بەڵکوو دەرد و ڕەنجێکی تازە و قورسیشی دەدا بە کۆڵیا.

**ئەفلاتوون:** ژیان بە بێ ڕەخنە، پووشێک ناژێ.

**ئەرەستوو:** ویست و ئاواتەکانتان لە نێوان دوو دیواری قایمی «ئیرادە» و «عەقڵ»دا جێگیر کەن.

**ئەرەستوو:** ئینسانی عاقڵ و تێگەیشتوو، ئەوەی کە دەزانێ نایڵێ، بەڵام ئەوەی کە دەیڵێ دەیزانێ.

**ئەرەستوو:** شایی و خۆشی لە ماڵێکدا هەیە، کە خۆشەویستی تێدا بێ.

**ئەریپید:** ئەزموون لە سەر قەرەوێڵی نەرم و جێگاوبانی بۆن خۆش و باڵنجی پەڕی قوو، نایەتە دەست.

**ئاناکرئۆن:** ساتی حازر بەنرخترین زەمانە، چونکە کاتی دەرفەت و فرسەتە بۆ کار و تێکۆشان.

**ئیمیرسون:** ئەوەی کە هەن ئێوە باشتر دەناسێنێ، هەتا ئەوەی کە دەیڵێن.

**ئاناتۆل فڕانس:** پێکەنین و بزە باشترین و گرنگترین کەرەستەی شەڕە، لەگەڵ ناکۆکی ژیان.

**ئاناتۆل فڕانس** : دڵخۆشی و پێکەنین باشترین چەک، بۆ بەرەنگاری لەگەڵ ژیانە.

**ئاناتۆل فرانس:** پێکەنین لە مەیدانی ژیاندا، گەورەترین ئەسلەحەیە.

**ئاناتۆل فرانس:** بە کەسێک کە دەڵێ ئەمن خەیاڵاتی نیم، بڵێن کە، ئەوە یەکەم خەیاڵاتی تۆیە.

**ئاناتۆل فرانس:** مردن قەت دوژوارتر نییە لە، لە دایک بوون.

**ئالفرد کاپو:** خەم خواردن بۆ ڕابردوو ناحەزە، کەسێک کە نەتوانێ خۆی لەگەڵ ژیانی ئێستا ڕێک بخا، بەشکەست خواردوو بە حیساب دێ.

**ئوریانا فالاچی:** تەنیا ئەوانەی زۆر شیوەن و زاری دەکەن، دەتوانن قەدری جوانی و بەختەوەری بزانن وجوان پێبکەنن.

**ئەمیل زۆلا:** پێکەنینی فەقیر و هەژاران لە دەروبەری لێویان، دوورتر ناکەوێ.

**ئالفرد دۆمۆسە:** ئینسان خۆی ناناسێ، مەگەر لە کاتی تەنگانە و چەرمەسەریدا.

**ئابراهام لینکۆڵن:** بە بێ حکومەت دەکرێ بژین، بەڵام بێ کتێب و چاپەمەنی ناکرێ.

**ئاندرە ژید:** گەورەیی لەوەدا نیە قەت نەکەوین، بەڵکوو لەوە دایە ئەگەر کەوتین هەستینەوە.

**پرۆفسۆر ئولریش مارزلف** ئەندامی ئاکادمی چیرۆک ناسی لە شاری "گوتینگن"ی ئاڵمان لە کتێبی دابەش کردنی چیرۆکە ئێرانییەکان دەڵێ:

چیرۆکی کوردی تایبەتمەندی خوی هەیە و دەبێ جودا لە چیرۆکی گەلانی تر بەراوەرد بکرێت.

**ئارتۆر بریزان:** خەڵک لەوەی کە بەختەوەری پایەی ژیانە، یەک قسەن، بەڵام لەکام ڕێگا پێی دەگەن، جیاوازی‌یان هەیە.

**ئالبرت هۆبارد:** ئەگەر دەتەوێ منداڵی عاقڵ و ژیرت بێ، زانا و ڕوناکبیر بە.

**ئەمیر کەبیر:** وامدەزانی وڵات وەزیری ڕووناکبیر و ژیری دەوێ، تازە دەزانم پادشای عادڵی دەوێ.

**ئەبو عەلی سینا:** ئەگەر زانیبام کە مەحکووم بە مەرگێک لە کاتی جەزادانـدا چەند هیوای بە گەڕانەوە بە ژیان هەیە، قەدری ئەو ڕۆژانەم دەزانی کە بە غەم و پەژارە رامبواردبوو.

**ئەبو عەلی سینا:** بەخشین و لێبوردن لـە پلـەی هێـزو قودرەتـدا، نیـشانەی ئازایەتی‌یە.

**ئەبو عەلی سینا:** راستی و دروستی، رازێنەرەوەی زانستە.

**ئەردەشیری بابەکان:**جل وبەرگی بەختەوەرەکان لە دووشـتان چنـراوە: لـە رووخۆشی و خێرخۆازی.

**ئەلفۆنس دودە:** نەتەوەیەک کە زمانی خۆی بە باشی بزانێ، ئەگەر ڕۆژێکیش دیلی نەتەوەیەکی‌تر بێ، وەک بەندییەکە کە کلیلی بەندیخانەی لە باخەڵدا بێ.

**ئایا ئەزانی؟** ئەوەی دەیخۆی بەلەش دەگا، ئەوەی دەیدەی بـە سـەدەقە، بـە رۆح دەگا، ئەوەی دەیهێڵیتەوە بە کەسانی تر دەگا.

**خواجە عەبدوڵڵا ئەنساری:**خودایا، هەر تۆ سزاوار دۆستیت، و هەر تۆ لە کاتی قین‌دا بەخشەندەی.

**خواجە عەبدوڵڵا ئەنساری:** دڵ پرسی لە گیان، مەبەست لەو ڕێگەی گرتووتە بەر، سەرەتای چییە؟ دوایی چی دەبێ. دڵ پرسیاری کرد: نـەمان چییـە، مـان چییە؟ گیان لە وەڵامدا وتی: خۆ لە بیر بردنە، نـەمان بەلـێنی دۆسـت بـە جـێ هێنانە و مانیش گەیشتن بە حەقە.

خودایە، لەو کاتەوە مێهری تۆ بە دڵ چەسپاوە، دڵۆڤانی یەکان شوێن پێیـان نەما. خودایە! من کێم کە ویستاری تۆ بم؟! چۆن ئاگادار لە بایەخی خۆمم.

قسە لە گەڵ دۆست کۆتایی نایێ، چۆن بێ نیاز لە هەمو لایێ.

لە راستی بە دەر نابێ بگوترێ، هەموو راستی‌یەکیش نابێ بگوترێ.

دۆستێ بگرە قەت خەفەت بار نەبێ، هەڵبژێرە پادشایەک بەرکەنار نەبێ.

هەر کەس بۆ ماڵ، لەشی بلەرزێ، بایەخی دوو جۆی نییە، لە ئەرزێ.

**شیخ جەمال‌الدین ئەسەد ئابادی:** چووم بـۆ ولـاتانی ڕۆژئـاوا، ئیـسلامم دی، بەڵام موسلمانم نەدی و چوم بۆ وڵاتانی ئیسلامی، موسلمانم دی، بەڵام ئیسلامم نەدی.

**ئەلبیرت ئەنشتاین:** زانست بە بێ ئایین، بە شەلە شەل بەرێوە دەچێ و ئایین بە بێ زانست، کوێرانە دەستە کوتە دەکا.

ئەو کێشە و گرفتانەی کە دەکرێ چارە سەریان بۆ بدۆزێتەوە، دەبێ مرۆڤ لە بەرانبەریانەوە دەستاوسان نەبێت، ئەو گرفت و کێشانەش کە چارە سەر ناکرێن، دەبێ خزمەتیان بۆ نەخوازی.

دەبـێ بـە چـاوی قـەدەری خـودای گـەورەوە بـۆ ڕابـردوو و موسـیبەتەکان بڕوانرێت، بەڵام دەبێ لە گۆشەنیگای تەکلیفی خوای گەورەوە بڕوانرێتە داهاتوو.

**ئیمرسۆن:** هەوڵ بدە بە جۆرێک بیت، کە نەتوانی بـە هـەموو کـەس بـڵێت، وەک من بە.

□

## پیتی ب

**شێخ حەسەنی بەسری:** حەزم ئەکرد بە قەدەر کێوی ئوحود ئالـتون و زێـوم ببوایە، هـەتا هـەمووی بـۆ خوێندنـەوەی مـەولوودی حـەزرەتی محەمـەد(د.خ) سەرفم بکردایە.

**بوزەرجمێهر**(عیلم و سـەروەت) یـەکێک لـە بـوزەرجمێهری پرسـی: عـیلم باشترە یان سەروەت؟ بوزەرجمێهر گوتی: عـیلم، ئـەو کەسـە پرسـی: دەی بـۆ ئەهلی عیلم خزمەت بە سەرمایەداران ئەکەن، بەڵام ئەهلی سەروەت خزمەت بە زانایان ناکەن.

بوزەرجمێهر لە وەڵامدا گوتی: هۆی ئەم کارە ئەوەیە، کـە ئـەهلی عـیلم بـە بۆنەی زانستەوە کە هەیانە، قەدری ماڵی خۆیان دەزانن، بەڵام دەوڵـەمەندان بـە هۆی نەزانین قەدری عیلم نازانن.

**مەلا مستەفای بارزانی:** کابرایەکیان گرتبوو، لە دارێکیان بەست، لەوکاتەدا لێیان پرسی ئەرێ پیاوەکە، چیت پێ خۆشە و دڵت چی دەوێ و ئاوات و مەبەستت چیە؟ گرتووەکە وەڵامی داوە کە: تکام ئەوەیە لەو دارەم بکەنەوە، و لە دارێکی دیکە، کە سێ هەنگاوی بەینە بمبەستنەوە. جا لەو قسەیە کە ئەو گرتوویە گوتی، کێشک چیەکان سەریان لێ سووڕما و نەختێک ڕامان و لە بەر خۆیانەوە گوتیان: دەبێ ئەوە چی هەڵویست و مەبەستێکی تێدا بێ و قازانجی ئەو ئاڵ و گۆڕە دەبێ چ بێ؟ لێیان پرسی: جا کابرا مەبەستت لەو کارە چیە؟

وەڵامی داوە کە ئەو کاتەش بۆ خۆی دەرفەتێکە کە سێ هەنگاو ڕێ دەڕۆم و باوی لاقم دەکرێتەوە.

**مەسعوود بارزانی:** دەبێ هەرکوردێک لە ئوروپا یان لە ئەمریکا خۆی بە باڵوێزی کورد بزانێ.

**ئەمیر بەدرخان:** ئەمن پاشای ئەم وڵاتەم نەک سوڵتانی عوسمانی، ئەگەر چی ئەو بە هێزترە، بەڵام من لەو شەریفتر و پیاو چاکترم.

**بدیع‌الزمان شێخ سەعید نوورسی:** ڕۆژگارێک دەبێت کە تەنها یەک وشە سوپایەکی تەواو گیرۆدەی جەنگ دەکات و تەنها یەک فیشەکیش دەبێ بە هۆی لە ناو چوونی سی میلیۆن کەس.

زامەکانی ژیان سارێژ دەبن، بەڵام زامەکانی عیززەتی ئیسلامی و شەڕەف و سەربەرزی نەتەوەی ئیسلام، یەکجار قوڵن و هەمیشە هەر دێنەوە سۆ.

**بودا:** سەر راستی و نیاز پاکی باشترین کامەرانیە و بەخێلی و بوختانیش خراپترین شەرمەزاریە.

**بودا:** وا هەڵدەکەوێ لە لەشێکی سست و لاوازدا، مێشکێکی (فکر) گەورە جێگیر بێ.

**بودا:** ژیانی مرۆڤ وەک دڵۆپێک ئاوی روون وایە، لە سەر گوڵێک کە دەخزێ و دەرژێ.

**باڵـزاک:** دەســت داشـۆردن لـە هیـوا، هەنگاوێکـە، کـە بـەرەو گۆڕسـتان هەڵدێتەوە.

**بووعەلی سینا:** دۆستی چاک نیشانەی ئەوەیە کـە هەڵـەکانت بـۆ داپۆشـێ، مۆجیاریت بداتێ و نەهێنیەکانت ئاشکرا نەکا.

**بنیامین فرانکلین:** لەو جێیەی زەماوەندێکی بێ ئـەوین روو دەدا، حەتمـەن ئەوینێکی بێ زەماوەند پەیدا دەبێ.

**برتراند بارو:** داری ئازادی بە خوێنی شەهیدان ئاودێری دەکرێ.

**برتراند بارو:** نـەمامی ئـازادی تـەنیا کاتێـک گەشـە دەکـا، کـە بـە خـوێنی ستەمکاران ئاودێری بکرێ.

**بوفین:** قەڵەمی هەرکەس نوێنەر و وێنەی بەرچاوی خۆیەتی.

**برتراند راسڵ:** لە برتراند راسڵ یان پرسی تەجرەبە چیە؟ وتی: مامۆستایەکی بێ رەحمە کە بەرهەمی کاری دەنوێنێ و بە دوای ئەوە، دەرسەکەی دەدا.

**بازیلی نیتکتین** نووسەری بە ناوبـانگی رووسـی لـە کتـێبی خـۆی بـە نـاوی (خوێندنەوەی مێژوویی و کۆمەڵایەتی) لە سەر کورد و کوردستان ئاوا دەڵێ:

بە بڕوای من ژنانی کورد دەورێکی یەکجار کاریگەر و سەرەکییان لە رابردودا، لە ناو بزاڤی ژیانەوەی گەلی کورددا گێڕاوە، بەڵام لەو بارودۆخـە و بـەو جێگـە و پێگە کۆمەڵایەتیە نزم و چەواشەی کە لە مێژووی سەردەم دا پێیـان بەخـشراوە بە حەستەمی دەزانم کە تەنانەت بتوانن دەورێکی زۆر زۆر بچووکیش لە خەباتی رزگاریخۆازی کەلتوری و مەدەنی و رامیاری داهاتووی گەلەکەیان دا بگێڕن.

□

## پیتی پ

**پێغەمبەری ئیـسلام (د. خ):** هـەر کەسـێ ناخۆشـی لـە سـەر موسـڵمانێک هەڵگرێ، خودا ناخۆشی یەکی، لە ناخۆشی یەکانی قیامەتی لە سەر هەڵدەگرێ.

**پیتر یویتنف** هونەرمەند و شانۆنووسی ناودار: کەسانێک کە لە سیاسەت بە پلەو پایەی بەرز ئەگەن لە کاری پێشووی خۆیان هیچ کات سەرکەوتوو نەبوون. وەک هێشتا نەبووە، دوکتور یان وەکیلێکی سەرکەوتوو بە سیاسەتمەدارێکی باش بێت.

**پاستۆڕ:** سەبووری و خۆڕاگری دەروونی، گەورەترین بوێریە، و بە هێزترین هەناوی دڵە.

**پاستۆڕ:** خۆڕاگری و هێمنایەتی، گەورەترین عیززەت و پیاوەتی‌یە.

**پێندار:** بەختەوەری گوڵێکە، کە قەت لە خانووی حەسودان و بەرچاوتەنگان ناڕوێ.

**پوشکین:** دۆستایەتی کاتێک لە بەین دەچێ، کە بڕوا بە یەکتر نەمێنێ.

**پاسکاڵ:** گەورەیی وسەربەرزی ئینسان، لە بیرو ئەندێشە دایە.

**پیکاسۆ:** ماچێکی دایکم، منی کردە وێنەکێش.

**ویکتۆر پوشە:** کەسێک لە جیهاندا بۆ ژیانی و هاو ڕەگەزەکانی تێ نەکۆشێ، وەکو منداڵێکە خۆی بە ملی کۆمەڵ هەڵواسیوە.

**چەند شت:**

١ـ پێنج شت دەبێ بۆیان تێ بکۆشین:

یەکەم: دڵسۆزی، دووهەم:پەیمان پەروەری، سێهەم: خۆڕاگرتن لە کاتی تورە بوندا، چوارەم: لێ بوردن لە کاتی دەست ڕۆیشن دا، پێنجەم: خوو و ڕەوشتی جوان.

٢ـ پێنج ڕەوشت خۆتی لێ دوور بخەرەوە:

یەکەم: زۆرداری، دووهەم: پیسکەیی، سێهەم: درۆکردن، چوارەم: لوت بەرزی، پێنجەم: سیخوڕی.

٣ـ پێنج شت پێویستە بیانپارێزین:

یەکەم: ئایین، دووهەم: شەرەف(ئابڕوو)، سێهەم: نیشتمان، چوارەم: بیروباوەڕ، پێنجەم: کەرامەت.

**پوشە:** هەر ئیش و کردەوە و قسەی خراپ بکەیت، ئاوا بە خوتت کردووە.

**پوت** زانا و پسپۆری ناسراوی ئالمانی: زمانی کوردی یەکێ لە زمانەکانی ڕەسەن و سەربەخۆییە و لە زمانەکانی ئاریایی دێنە ژمار.

**عەبدوللا پەشێو:**

ئادەمسمیت وکیسنجەر، بێنە خاکی چارە ڕەشان
یەکەم دەکەن بە چایچی یەک، لە وەزارەتی ئابووری
ئەوەی دووەم لای پەرلەمان، بڕنۆیەکی دەکەنە شان

**عەبدوللا پەشێو:**

شەو لە خەوما، ئارامگای حاجیم دیتەوە،
چۆکم دادا سوژدەم برد بۆی،
گوتم، حاجی پەریشانی، سەری کز کرد، دەستی دانا سەر دلی خۆی
گوتی: مەرد بە زیندووم کەوە
گوتم: گەورەم! من عیسا نیم، چۆن زیندووت کەمەوە، بێژە
گوتی:لێرە دەرم بێنە، دوو بەرەکی، لە شوێنەکەی من بنێژە.

**عەبدوللا پەشێو:**

لە غەیبەوە هاتومەوە، هاتومەوە پێتان بلێم:
ئەم وڵاتە، قەت بێ خرمەخرمی تاڵ و زرمە و زرمی پۆستاڵ نابێ
تاکوئێوە ئەو پردە بن،
هەردیل بوون و هەر دیل دەبن، تا چەرچی و دز سەرکەردە بن.

□

## پیتی ت

**تاهیر تۆفیق** هونەرمەندی کورد: لە مامۆستا تاهیر تۆفیقیان پرسی گۆرانیەکانت چ شوێنێکی لەسەر خەڵک دائەنا؟
لە وڵامدا گوتی: لەبیرمە کراس زەردێی من بڵاو بووە، کیژەکان یەک جێ کراسەکانیان کردە زەرد.

**تۆلستۆی:** ئەوین ئالتوونێکی پڕ بایەخە، ئەگەر لە گەڵ داوێن پاکیدا تێکەڵاو بێ.

**تۆلستۆی:** چارە نووسی مرۆڤ لە تەکامولی ئەودا شاردراوەتەوە.

**تۆلستۆی:** ژین گاڵتە نیە، بەلکو وەزیفەیەکی دژوارە.

**توماس هگل:** بە ڕاستی باوەر بە خودا و زانست، لێک جیا نابنەوە.

□

## پیتی ج

**جواهیر لەعلی نەهرۆ:** ڕێگای کۆنی مێژوو بێ وەستان درێژەی هەیە، وەک دەریای نەناسراو دیارە.

**جەواهیر لەعلی نەهرۆ:** لە دونیایێکی زیندوو، هەمو شتێک ئاڵ و گۆری بەسەر دادێ، ئاو تا ئەو کاتەی خوڕەی دێ و لە حەرەکەت دایە، تازە و پاک دەمێنێ، هەرکات ڕاوەستاو مایەوە، وردە وردە دەگەنێ و دەبێتە زەلکاو.

**جوبران خەلیل:** مەڵێ بە دوای هەقیقەتدا دەگەڕێم، بڵێ دەمەوێ هەقیقەتێ لە هەقیقەتەکان بدۆزمەوە.

**جۆرج سانتایان:** بۆ لە دایک بوون و مردن هیچ چارەیەک نیە، کەوابوو لەنێوان ژیان و مەرگ باشترین کەڵک وەرگرە.

**جۆزیف لاتین** مێژوونووسی کۆمەڵایەتی: سەرانسەری قەڕنی نۆزدە بریتی بوو لە نەتەوە ویستی سیاسی و ئابووری کە ئەوەش بوو بە هۆی سازدانی

موستەعمرە و وڵاتی ژێردەست، ناسیۆنالیزم بوو بە سەرچاوەی زۆر ویستن و داگیر کردن و قازانجی دەوڵەتە جۆراوجۆرەکان.

□

## پیتی چ

**چارلی چاپلین:**گرنگترین و گەورەترین شانازی من، پێکەنین خستنی، خەڵکی گریانە.

**چوار شت پشتی پیاو ئەشکێنیێ:** دوژمنی زۆر، قەرزی زۆر، منداڵی زۆر، ژنی نابار و نەساز.

□

## پیتی ح

**ئیمام حوسەین (د. خ):**هەر کەس پەیڕەوی لە حەقەوە نەکات، کەم عەقڵە.

**مامۆستا حەسەن سەلاح سۆران:** تەسمیم گرتن لە دو جێگەدا گرنگترە. لە سەر دوو ڕێیان و لە دەم بۆن بەست دا.

ناشیرین ترین خەسڵەتی ئینسان، ڕقە.

چاکترین سەرمایە، منداڵی ساڵحە.

میراتی مرۆڤ دوو شتە: ئاسار و منداڵ.

هەموو شتێک بە هەموو کەسێک مەڵێ.

هەر ترسێک مەرگێکە، ئەو کەسەی نەترسێ، نامرێ.

مرۆڤی گەورە وەک کێوی بەرز وایە، سەری ناباتە ژێر تەم و مژی ژیان.

فرمێسک وەک باران وایە، تەپوتۆزی عاسمانی ژیان، دادەشۆرێ و بەرچاو ڕۆشن دەکاتەوە.

□

## پیتی خ

**خواجه بەهائودین:** له خواجه بەهائودین یـان پرسـی تـۆ لـه کـام نەتـەوە و هۆزی، گوتی: کەس بە نەتەوە و هۆز بە جێگایەک نەگەیشتووە.

**خو و ڕەوشته خراپەکان:**

١ـ فیز و خۆ بە زل زانین ٢ـ حەسـوودی ٣ـ غەیبـەت ٤ـ ڕیاکـاری ٥ـ فیتنەیی ٦ـ کینه و قین ٧ـ رژدی ٨ـ ترس ٩ـ دوورۆیی ١٠ـ خیانەت ١١ـ غـەدر ١٢ـ فێڵبازی ١٣ـ تەماع ١٤ـ حیرس ١٥ـ تەممەڵی و سوستی ١٦ـ زۆر وێـژی ١٧ـ رووتاڵی ١٨ـ خۆ زەلیل کردن له بەرانبەری تاوانکارەوە.

□

## پیتی د

**دیل کارنێگی:** بۆ ژیان و ژیانەوە تێکۆشه، بەڵام خەفەتی بۆ مەخۆ.

**دکارت:** خامه له دەستی نووسەری خائین، وەک خەنجەرێکی ژەهراوییه کـه دڵی مرۆڤ، لەت لەت دەکا.

**داستایۆفسکی:** ژیان تێکەڵاوێکه له پێکەنین و گریان.

**دیهخۆدا:** فیکر و ئەندیشه، پایه و ئەساسی عەقڵه.

**ف.دتیل:** ئەمن، هـیچ کـات بـڕوام وا نـەبووە، کـه کـورد خـاوەن ئـەدەب و فۆلکلۆرێکی ئاوا پڕ ناوەڕۆک و بەبایەخه.

**دیو ژن:** زۆر کەس مەبەستیان له ژیان خواردنه، من مەبەسـتم لـه خـواردن، ژیانه.

□

## پیتی ر

**ریشیلیو** سەرۆکی گەورەی فەڕانسه: ئەگەر رەخنه و پێشنیاری دۆستان و یـا دوژمنان نەبوایه، هەرگیز له کارەکانی خۆمدا سەرکەوتوو نه ئـەبووم و مـن ئـەم سەرکەوتنه له ئەو رەخنه و پێشنیارانه دەزانم.

**ریکاردۆ:** لە دەورانی ژیانمدا زۆر جار تووشی هەڵە بووم، بەڵام هیچ هەڵەیێک، لە هەڵەی زمان خراپتر نییە.

**رێتشیلۆ:** پێنج شتتان تاکوو هەیە، خۆشت بوێ:

لاوەتی پێش گەیشتن بە پیری ـ سلامەتی پێش لە نەخۆشی ـ دارا بوون پێش لە نەداری ـ ئازادی پێش لە زۆرداری ـ سەرفەرازی پێش لە زەبوونی.

**رووسی:** بوختان وەک رەژدی وایە ،ئەگەر نەتسووتێنێ لانی کەم، ڕەشت دەکا.

**رۆماریۆ:** شۆڕش کردن زۆر ئاسانە، بەڵام ڕاگرتنیان چەتوونە.

**رۆسو:** ئینسان ئازاد، لە دایک بووە.

**رابێرت فراست** شاعیری ئەمریکایی: شێعر بە شێوەیەکی زاتی لە گەڵ وەرگێڕان دژایەتی دەکا.

**راوەندی** لە ئەدەبیاتی عەرەب دەڵێ: ژیانی زانا سەختە، نەزان لە خۆشی‌دایە، سەرم سووڕماوە خەریکم کافر دەبم.

**ڕۆژمینی** مۆسیقازانی ناوداری ئیتالیا: ئاگادار بووم کە دەوڵەمەندەکان و دارودەستەی هۆگرم، خەریکن پەیکەرێک بۆم دروست بکەن. لە یەکێکی پرسی: ئەم کارە چەندە خەرج دەبات. وتیان: نزیک بە دە میلیۆن فرانک.

ڕۆژمینی بە نارەحەتیەوە گوتی: دەی جا باشە، پێنج میلیۆن فرانک بدەن بە من، حازرم لە سەر سەکۆیەک تا ئاخری عومرم ڕاوەستم.

□

پیتی ز

**زیگفریش:** خۆرئاوایی مێشکی پێشەسازی هەیە، بەڵام خۆرهەڵاتی مێشکی هەست ودڵسۆزی هەیە و لە بیر کردنەوە و رێگەدانان و جووڵانەوە دوورە.

□

## پیتی ژ

**ژول لابۆم** نووسەری ناوداری فەڕانسە: عیلم و زانست لە لایەن موسلمانان بۆ دونیای ئەمڕۆ هات و ئەم زانیارییسە لە قورئانەوە وەک دەریایێکی نادیار، کە جیهانیان فێری زانست ئەکات، بە ئێمە گەیشت.

**ژول روبن** نووسەری فەڕانسە: ئەگەر کەسێ کتێبێکی لە تۆ ویست، لە وەڵامدا بڵێ، کتێبێ بایەخی خوێندنی بێت، دەبێ بیکڕی.

**ژول سیمۆن:** پێکەنین و خۆشحاڵی بیر و زەین تیژ دەکا و لەش بە هێزو پتەو ڕادەگرێ.

**ژان ژاک ڕۆسۆ:** سینەیەک کە لە زیکری خودا بێبەش بێت، وەک مەحکەمەی بێ قازی‌یە.

**ژان ژاک ڕۆسۆ:** ئاوات و ئارەزو، دوایین شتێکن کە دەست لە یەخەی ئینسان دەکەنەوە.

**ژان ژاک ڕۆسۆ:** مرۆڤ ئازاد لە دایک بووە، بەڵام لە هەموو شوێنێک لە کۆت و زنجیردایە.

**ژان ژاک ڕۆسۆ:** باشترین دەوا بۆ دڵشکاو ئەوەیە، جارێکی دی دڵی بشکێنی.

**ژان ژاک ڕۆسۆ:** هەر چەشنە عەیش وخۆشی‌یەک ڕەنج و زەحمەتی بەشوێن دایە و ئەگەر بە زوو نەبێتە هۆی نارەحەتیمان، لە داهاتوودا بەرۆکمان دەگرێ، تەنیا دوو خۆشی هەیە کە بەرهەمی ناخۆش و پەشیمانی بە دوا دا نیە، یەکێکیان چاکە لەگەڵ خەڵک کردن و ئەوەی تر ئەنجامی ئەرک و ئەسپاردەیە.

**ژان ژاک ڕۆسۆ:** باشترین دەرسی ژیان ئەوەیە، کە دڵی کەس لە خۆت نەڕەنجێنی.

□

## پیتی س

**سوڵتان العارفین ئیمام جەلالەدین سیوتی:** لە هەر ماڵێک مەلوودی حەزرەتی محەمەد(د.خ) بخوێنرێ، ڕەحمەت بە سەر ئەو ماڵە یا ئەو مزگەوتەدا ئەبارێ.

**سەیید قوتب:** ئەم دونیایە پڕە لە مردووی زیندوو نەما.

**حەزرەتی سلێمان:** بڕۆ سەیری مێروولە بکە.

**سوڵتان سەلیم:** مێش کێشەیان لە ناو کەوێ، پیاو دەتوانێ تێر بخەوێ.

**سیسرۆن:** ئەزمون، دەرسێکی بەنرخە، کە بایەخی لە هەموو دەرسێکی گەورەی مامۆستایان زیاترە.

**سیسرۆن:** هۆدەی بێ کتێب، وەک لەشی بێ رۆحە.

**دوکتور ساخالۆف:** دڵخۆشی و ڕووخۆشی دەرمانێکە کە سروشت بە خۆڕایی و بۆ چارە سەر کردنی ئێمە لە ئیختیاری ناوین.

**سوقرات:** هەتاو دەتوانێ ئاوی دەریا وشک بکا، بەڵام لە وزەیدا نیە فرمێسکی ژنان لە بن بێنێ.

**سوقرات:** ٧٢ساڵە دەخوێنم و دەنووسم، تازە دەزانم کە هیچ نازانم.

**سوقرات:** ئەمن و خەڵکی ئاتێن نەزانین. ئەمن دەزانم کە نەزانین، بەڵام ئەوان زانا نین کە بزانن نازانین.

**سوقرات:** نزیکترین شت بە ئینسان مەرگە و دوورترین شت ئاواتە.

**سوقرات:** تەگبیر و ڕاوێژ لەگەڵ دوژمنیش پێویستە، تا پلە و پایەی دوژمنایەتی ئەو دەرکەوێ.

**سوقرات:** پیاوێک لە (سوقرات)ی پرسی ژن بێنم یا نەیهێنم؟ وتی: هەر کامێکیان بکەیت هەر پەشیمانیت.

**سوقرات** دەڵێ: ئەگەر لەوە نەئەترسام کە خەڵکی ئاتن رەخنەم لێبگرن و بڵێن سوقرات دەم لە هەموو زانستەکانی جیهان ئەوەشێنێ، ئەموت: هیچێ نازانم.

**شێخ سەعدی شیرازی:** دوو کەس ڕەنج و زەحمەتی بێ فایدەیان کێشا، یەکێ ماڵی جەم کرد و نەیخوارد وە یەکێ عیلم فێر بوو، عەمەلی پێ نەکرد، هەر چی عیلم فێر بی و فرە بزانی، چوون عەمەلی پێ نەکەی، نەزانی.

فێر بوونی عیلم و زانینی قورئان و حەدیس بۆ ئایین پەروەری یە، نە بۆ ماڵی دونیا.

هەر نهێنی و سیرڕێکت لای دۆست مەڵێ، چۆن شایەد ڕۆژێ بێتە دوژمنت. هەر چی خراپیشە لە گەڵ دوژمن مەکە، شایەد ڕۆژێ بێتە دۆستت.

دووکەس دوژمنی وڵات و ئایینن: پادشای بێ حیلم و حەوسەڵە، پارێزگاری بێ عیلم و زانیاری.

بە تەعریفی نەفام و نەزان و کردەوەی خۆت غەڕە مەبە و لە خۆت دەرمەچۆ.

یار و دۆستێ کە بە تەمەنت بە دەست هێناوە، حەیفە بە قسەیەک، بی ڕەنجێنی.

**سەعدی** (کتێبی گولستان): زانای ناپاک، کوێری مەشعەل بە دەستە.

□

## پیتی ش

**شێخ سەعیدی پیران:** بە رووی جەلادەکاندا قیڕاندی و وتی: جێی شەرەف مەندیمانە، لە پێناوی رزگاری وڵاتەکەماندا، دژی کۆیلایەتی خەباتمان کردووە، و لە سێدارە ئەدرێین، خەباتمان ئەرکێکی نیشتمانی بوو لە ئەستۆماندا، بە شەرەف بە ئەنجامامان گەیاند. ئەرکی هەموو کوردێکی خاوێنیش ئەوەیە خەبات لە رێی رزگاری وڵاتەکەی واتە کوردستانی زۆرلێکراو لە زولمی لە ڕادە بەدەری بکات.

**شوخی به پیتەکان:** پیاوی نزیک بین تا بەر لوتی بە زەحمەت ئەبینێت.
هەر چەند لە زەوی دوورتر بیت، لە چاوانی ئەوانی زەوی چکوولەتری.
پیاوی دوور بین بە زۆر بەرپای خۆی ئەبینێت.
ریاسەت وەکو سەندەڵی راحەت وایە کە دانیشتن لە سەری زۆر ئاسانە، بەڵام هەستان لە سەری زۆر دژوارە.

**شێخ شبلی:** شێخ شبلی دەیگوت: شەوێک کە مەنسووری حەلاجیان لـە دار دا، من لەگەڵ خودای خۆمدا موناجاتم ئـەکرد. دەمـەو بـەیان وەختێـک نـوێژم خوێند لە خودام پرسی: خودایە ئەو بەندەیەی تۆ زۆر پاک و موسڵمان بـوو، بـۆ وای بە سەر هات.

شەو لە خەودا دیم کە فریشتەی غەیب، پێمی گوت: ئەو شـتێکی لـە ئێمـە دەزانی و نا ئەبوو ئاشکرای کردایە، بەڵام نەیتوانی ئەماناتی ئێمـە ڕاگـرێ و هـەر بەم هۆیەوە چووە سەر دار.

**شوپێنهاوێر:** هەر چەند جەماڵ و جوانی هـۆی شـەرافەتن، بەڵـام نزیـک لـە هەزاران شەڕ و فیتنەن.

**شوپێنهاوێر:** ئێمە زۆر کەم سەبارەت بەو شتانەی هـەمانن بـیر دەکەینـەوە، بەڵام هەمیشە لەبیری ئەو شتانەین کە نیمانە.

**شانفۆر** زانای گەورە و بە ناو بانگی ئەخلاق لە فەڕانسە: ئـەدەب و تەربیـەتی هەرکەس، لە دوو شتەوە سەرچاوە دەگرن. یان لـە هـۆش و عەقـلی سروشـتی خۆیەوە، یان بێ ئەدەبی و کەریەتی ئەم وئەوەوە.

**شکسپیەر:** ترسەنۆک پێش مردن هەزار جار دەمرێ، بەڵام مرۆڤی بێ باک و نەترس، جگە لە کاتی مردن هیچ کات تامی مردن ناچێژێ.

**شکسپیەر:** هەر ئافرەتێک پێش لە شو کردن تـەنیا مێردێکـی باشـی دەوێ، کاتێک دەستی پێ گەیشت، ئینجا هەموو شتێکی دەوێ.

**شکسپیەر:** دەست هەڵگرتن لە هیوایەکی پووچ و بێ حاسڵ، خۆی چەشنێ سەرکەوتنە.

**شکسپیەر:** هیوا باشترین ڕووناکی ژینە، بۆ مرۆڤی بێ هیوا ژیان بێ بایەخە.

**شکسپیەر:** جوانترین و ڕازاوەترین چرای ژیان، ترۆپکی هیوایە، هەر بۆیە بەشی ئینسانی بێ هیوا نەمانە.

**شکسپیەر:** هیچ شتێک بە ئەندازەی ڕەنج و بەدبەختی و چەرمەسەری ڕۆحی ئینسان، گەورە ناکات.

**شکسپیەر:** هەموو کاتی ژیان چالاکی بکەن و هەوڵ بدەن بەرگی شانازی و گەورەیی لە بەر کەن.

**شکسپیەر:** ڕۆژگار وەک زەریایەکە، کە لوتکەی ژیانمان بە سەریدا دەگاتە ساحیلی ئاوات و ئامانجی ئەو زەریا گەورەیە، هەمیشە لە حالی هەڵچوون و داچوون دایە.ئەمڕۆ ئارام بێ، سبەی لافاوی لێ هەڵدەستێ. لە ساڵەکانی ئارام بوونیدا هەل و دەرفەتت بەفیڕۆ مەدە.

**شالتور:** ناخۆشترین و تاڵ ترین ڕۆژ لە عومری ئێوەدا، ڕۆژێکە کە هەرگیز پێنەکەنن.

**شاتۆبریان:** بەختەوەری تۆپێکە کە هەر دەم بە دوایدا هەڵدێین، بەڵام ئەو کاتەی دەیگەینێ، لە خومانی دوور دەکەین.

**شاخنر:** لە ناکامی مەترسێن چونکوو ئەگەر تامی ناکامی نەچێژین، قەدری سەرکەوتن و بەختەوەری نازانین.

**شیللێر:** ڕێزی ژنانتان بگرن، ئەوان گوڵی ئاسمانی لە سەر زەویدا دەچنن، بەرگی جوان و ڕازاوەی ئەوین دەچنن، و لە پەردەی پاکیدا هەستی ناسک و زەریف پەروەردە دەکەن.

**شێلی:** لە وتاری "بەرگری لە شێعر" دا ئەڵێ: تەنانەت وشەیەکیش بەرهەمی هەست وڕۆحی شاعیر ... کە ... هەرگیز ناتوانێ ئەو کاتانە

تەجرەبە کاتەوە کەوا شاعیر بەرهەمەکەی تێدا خولقاندوە، یان ئەڵێ: درەخت دەبێ سەر لە نوێ شین بێتەوە، دەنا شکۆفە نادا و گوڵ ناکا.

**شێخ عەبدولقادری شەمزینان:** شێخ عەبدولقادر کە چووە بەر سێدارەکە وتی: ئەی جەلادەکان، شەرفمەندیە بۆمان، لە پێناوی سەربەستی نیشتمانەکەماندا، سەرمان بچێتە سەر سێدارە، بە خنکاندنی ئێمە، لە ڕق و توڕەبوونی گەلی کورد زیاتر، هیچی‌تر قازانج ناکەن و زیاتریش ورەی پێ پتەو ئەکەن بۆ سەر بەخۆیی و سەربەستی.

**دوکتور عەلی شەریعەتی:** هەر کەسێ مێژوو و خووخدەی مێژوو بناسێ، ددان بەوە دا ئەنێ، کە مێژوو ئایینی ترین و دیندارترین شتی ئەم جیهانەیە.

□

## پیتی ع

**حەزرەتی عومەر(د.خ):** هوشیار بن،بێکاری لە مەستی زیاتر درگای بەدبەختی و فەساد دەکاتەوە.

**حەزرەتی عومەر(د.خ) :** کە پیاوێک دەبینم، دەپرسم ئایا پیشەیەکی هەیە؟ کە وتیان پیشە و کاری نییە، لە بەر چاوم ئەکەوێ.

**حەزرەتی عەلی(د.خ):** کەسێ بە منداڵی فێر نەبووبێ، لە گەورەییشدا پێش نەکەوتووە.

**حەزرەتی عەلی(د.خ):** ساعەتێک بیر کردنەوە لە عیبادەتی زۆر باشترە.

**حەزرەتی عوسمان (د.خ):** بێدەنگی باشترین چارەسەر کردنی توڕەییە.

**حەزرەتی عوسمان(د.خ):** یادی دونیا تاریکییە، یادی پاشەڕۆژ ڕووناکی دڵ و دەرونە.

**ئیمام غەزالی تووسی:** خۆپەسەندی نەخۆشی‌یەکە، کە بنچینەی لە نەزانینی تەواوە و چارە سەر کردنیشی لە زانینی تەواوەیە.

**ئیمام غەزالی:** گۆمان هۆی گەیشتنە بە حەق، هەرکەس گۆمان نەکات، تەماشا نەکات و هەر کەس تەماشا نەکات هیچ نابینێت و هەر کەس هیچ نەبینێت بە کوێری و گۆمرایی ئەمێنێتەوە.

**حەزرەتی عیسای مەسیح:** مرۆڤ بۆ ئیش کردن دروست کراوە، هەر وەکو باڵدار بۆ فڕین.

**حەزرەتی عیسا:** چ سودێک ئەبەخشێ ئەگەر مرۆڤ خۆی دۆڕاندو گەردونی بردەوە.

**حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی:** ماوەیەکی زۆر بوو کە بە خەڵکم دەگوت: ئاوا بکەن و ئاوا بن، بەڵام لە ئەوەڵ پلەی مەعرەفەتی خوادا، گوتم خودایە: تۆ هەرچی ڕەزاتە وام لێکە.

**مامۆستا عەلی باپیر (ئیسلام و ریچکان):** ئەگەر چوار ژمارەی یەک(١) مان بە دەستەوە بن و بە پرژ وبڵاوی دایان بنێین و کۆیان بکەینەوە، ئەنجامەکەیان دەکاتە(٤= ١+١+١+١) بەڵام ئەگەر هەر هەمان چوار ژمارەیەی نابراو پێکەوە ریز بن و پاڵ بە یەک بنێن هێز و پیزو ئەنجامەکەیان یەکجار زۆر دەبێ کە دەکاتە ١١١١.

□

## پیتی ف

**فردریک گەورە (کەبیر)** پاشای ئاڵمان: فردریک گەورە پاشای ئاڵمان بە زوڵم و زۆر و دیکتاتۆری یەکجار بەناو بانگ بووە. ڕۆژێک نەخۆش ئەکەوێ و دوکتوری تایبەتی خۆی دێ بۆ لای و پێی دەڵێ: هیچ نیە تەنیا نەخۆشییەکی بچووکە. شا لێی تورە دەبێ و دەقیژێنێ بە سەریدا و دەڵێ: گەوجە بچووک کامە، تۆ بڵێ نەخۆشینێکی گەورەیە.

**فرانکلین:** ئەزمون و تەجرەبە قوتابخانەیەکە، کە قوتابیانی خۆی بە قیمەتێکی گران پێدەگەێنێ.

**فردریک:** کاتێک بڕیارت لە سەر کارێک دا،درگای هەموو دڕۆیەک ببەستە.

**فرانکلین:** قەناعەت و دەست پێوە گرتن، وەک کیمیا وایە و هەر شت بکەوێ دەیکاتە زێڕ.

□

## پیتی ک

**حاجی قادری کۆیی:** کورد هەر کورت بوون و خەبەریان لە خۆیان نەبوو.

**حاجی قادری کۆیی:** چاکەی خەڵکت لە چاودا نەبێ، چاکەی خۆداشت لە بیر نابێ.

**کۆنفۆسیوس:** مرۆڤێک کە بە خوێندنەوە خەریک دەبێ، کەمتر هەست بە پەژارە و خەم دەکا.

**کۆنفۆسیوس:** کاتێ خەریکی خوێندنەوەین، هەست بە تێپەر بوونی تەمەن ناکەین.

**کۆنفۆسیۆس:** گرینگترین پایە ونەرخ لە ژیاندا، بۆ راستی و دروستی و ئیمان دابنێین.

**کاموئینس:** گەورەیی ئەوە نیە کە بە باوانی خۆتان شانازی بکەن. غیرەتتان بێ کە خۆتان گەورەیی وەدەس بێنن.

**کرۆچە** فەیلەسووفی بەناو بانگی هاوچەرخی ئیتالیا: لە هونەردا ئەوەی کە بەیان ئەکرێ(شهودی)ە و هەر شتێکیش شهودی بێ بۆ وەرگێڕان نابێ.

**کانت:** تەواوی ژیان بە هیواداری بە ژیان تێ ئەپەرێ.

**کانت:** لە هەڵەکانی کەسانی تریش وەک هەڵەکانی خۆت چاوپۆشی بکە.

**کانت:** لە بەرامبەر هەموو کەسدا ئەتوانی هەڵوێست بگری، بێجگە ئەوانەی چاکەیان دەرحەق کردووی.

□

## پیتی گ

**گاندی:** ئەگەر لەم دونیا نەتوانین ئازاد بژین، باشتر ئەوەیە کە بمرین.

**گاندی**(ئینگلیس لە چاوی گاندی): کاتێک کە هێشتا ئەمریکا هێزێکی جیهانی و ئیستیعماری نەبوو، ئینگلیس لە زۆربەی وڵاتاندا ئاژاوەی دەگێڕا، لەگاندییان پرسی: ئینگلیس چلۆن ئەناسی؟ ئەویش لە وڵامدا گوتی: ئەگەر لە ناو دەریا، دوو ماسی پێکەوە شەڕ بکەن، دەستی ئینگلیسی تێدایە.

**گوتە:** ژن شەریکی ژیانە و هاوڕێی کاتی تەنگانەیە.

**گوتە:** سەرکەوتن و سەر فرازی موڵکی بێ ئەم لاو ئەو لای ئەو کەسانەیە، کە خاوەنی رۆحی خۆ ڕاگری و فیداکارین.

**ئیدمۆند گۆلدین:** خودا دوو چاو و زمانێکی بە مرۆڤ داوە، هەتا دوو هێندەی قسە دەکا بە چاو بیبینێ.

**ماکسیم گورگی:** ژنێک ستایش بکەین کە دایکە و تەواوی جیهان لە کانیاوی شیری ئەو پەروەردە کراوە.

□

## پیتی ل

**لابرۆییر:** جار جار ئینسان لە بەرانبەر ڕەشەکان لە بەختەوەری خۆی شەرم دەکا.

**لاسۆز** شاعیری فەڕانسەوی: ژن باشترین یار و هاورێیەکە، کە بەختەوەری، خۆشی و سەرفرازی لەگەڵ خۆیدا بۆ ژیان دێنێ.

**لارۆشفۆکۆ:** کەسێک کە لە پێناو گەیشتن بە ئامانجیدا دڵسارده و لە پەستا خۆی لێ دووره پەرێز رادەگرێ، لە راستیدا بۆ تەمەڵی خۆی بڕوبیانو دێنێتەوە.

بنیادەمی خاوەن هیممەت و ئیرادە، لە گۆڕەپانی ژیاندا قەد بە دەست گیروگرفت و دژواری‌یەوە، ناناڵێنێ.

**لارۆشفۆکۆ:** ئەوین سەرەتای هەیە، بەڵام کۆتایی نییە.

**لارۆشفۆکۆ:** هیچ جێگایەک هەرچەند لە باری ژیانی کۆمەڵایەتی‌دا باش بێت، ئەوەندە نییە کە پیاوی عاقڵ و زانا نەتوانێ کەڵکی لێ وەرنەگرێت و هیچ جێگایەک هەرچەندە ناخۆش و ناڵەبار بێت وەها نییە کە پیاوی گەوج بتوانێ کەڵکی باش و بە سوودی خۆی لێ وەر بگرێت.

**لاوی مونتاجیۆ:** ئەدەب لە لایەک بێ خەرج و بەرج، لەو لاش وەدەست هێنەری گشت ماڵ و گەنجە.

**لیئۆن تۆلستۆی:** نزیکترین ڕێگای گەیشتن بە ئامانج ڕێگای ڕاستە، نەک لاروگێڕو خوار.

**لویی ١٤:** مردنی هیوایەکی گەورە لە دڵدا، لە داچوونی تیشکی خۆری تابان دەچێ.

**لاندرو:** هیوا، دایکی ئیمانە.

**لوتر:** درۆ وەک بەفر وایە، هەر چەند کە بیگێڕن، گەورەتر دەبێ.

**لینکۆڵن:** دەتوانی تاقمێک لە کۆمەڵ بۆ ماوەیەک فریو دەی و تاقمێکیش بۆ هەمیشە، بەڵام تەوای کۆمەڵ بۆ هەمیشە فریو ناخوا.

**لێلینگ:** ئەگەر لە بەرزترین چیای ئەم وڵاتە سێدارەم بۆ هەڵواسن دەزانم کێم بە دواوەیە. ئەگەر لە قوڵترین شوێنی دەریا بخنکێم دەزانم کێ فرمێسکم بۆ دەرێژێ؟ *دایکم ئەی دایکی خۆشەویستم.*

**لئۆناردۆ:** کەسێک لە وەستاکەی وریاتر و کارزانتر نەبێ، شاگردێکی هەژارە.

**لامنایس:** ئێوە ئێستا پێتان ناوەتە سەرەتای بەهار،خۆتان بە بەهار و خۆشی‌یەکانی بسپێرن و سەر لە نوێ زیندوو ببنەوە. خۆتان بکەن بەگوڵێک و لە نێو گوڵەکانی‌تر بەهار دروست بکەن.

**لافۆنتین:** مردن شتێک نییە، بەڵام هۆشتان بێ کە لە بەرانبەر خودا ئاشکرا دەبن.

**لافۆنتین:** بە خۆڕاگری و پایەداری هەمو شت دێتە دەست، ئەو کەسە خاوەن گشت شتە.

**عەلامە ئێقبال لاهوری** (احیا فکر دینی در اسلام، شناخت حق): هیوا و ئاواتی من ئەوەیە، کە ڕۆژێک خەڵکی بە ئەو جێگا بگەن کە مانای ئەم ئایەتەی خوارەوە تێبگەن کە دەفەرمێ:

ئەو کەسەی کەڕۆژ و شەو بە دوای یەکتر دێنێ ئەوە خودایە، بۆ کەسانێک بیانەوێ خودا بناسن و سوپاسی بکەن.

**لوقمانی حەکیم:** لوقمانی دانا ئامۆژگاری کوڕەکەی ئەکا و ئەڵێ:

گیانی باوکی بەر لە هەموو شتێ، خودا ناس بە.

هەر ئامۆژگارییەک ئەکەی، لە پێشدا خۆت عەمەلی پێ بکە.

ڕێز و ئیحترامی هەرکەس، لە جێی خۆیا بگرە.

ڕاوێژ لە گەڵ ئینسانی خێرخۆازا بکە.

باوک و دایک بە هەل و غەنیمەت بزانە، زۆر ڕێزیان لێ بگرە.

کوڕم هاوتا بۆ خودا دامەنێ، چونکە هاوتا دانان بۆ خودا زوڵمێکی گەورەیە.

پەژارە و پەرێشانی مەرگی ڕۆحە و پێکەنین، ژینی ئەوە.

□

## پیتی م

**حەزرەتی محەممەد (د.خ):** حەقە بۆیە ڕەقە، خەوی بەیانی کەم رزقی دێنێ.

**حەزرەتی محەممەد (د.خ):** ژن مەڵهەمێکە بۆ برین، وەک دەرمانێک بۆ چاوان و دین، بەهەشت لەژێر پێی دایکاندایە.

**حەزرەتی محەممەد (د.خ):** مرۆڤی خاوەن بڕوا لە کونێکەوە دوو جار ناگەزیت.

**حەزرەتی محەممەد (د.خ):** هەر کەسێک ڕۆژووی مانگی ڕمەزان بە ئیمانەوە بگرێت و لە خراپە خوی بپارێزێ، گوناهە پێشووەکانی ئەبەخشرێ.

**حەزرەتی محەممەد (د.خ):** هەر کەسێک بە شوێن ڕمەزاندا شەشەڵان بگرێت، وەک ئەوە وایە تەواوی ساڵ بەڕۆژوو بوبێت.

**مەسعوود بارزانی:** مەسعوود بارزانی لە کونگرەی مەلای جەزیری لە دهۆک: لە جانتاکەی بارزانی نەمر دا کە لە هەموو هۆدە و ئەشکەوتەکان هەڵی دەگرت دوو کتێبی پیرۆزی لێ بوو، یەکەمیان قورئانی پیرۆزی تیا بوو کە سەر لە بەیانی دەیخوێند و دووهەمیان دیوانی مەلای جزیری بوو کە هیچ کات لە بارزانی نەمر جودا نەدەبوونەوە و لە خۆشی و ناخۆشی دا، لە گەڵی بوون.

**مۆنتسکیو:** ئەگەر تەنیا ئارەزووی بەختەوەریمان بوایە شتێکی ئاسان بوو، بەڵام ئێمە ئارەزوومان هەیە کە بەختەوەرتر لە خەڵکی دیکە بین، ئەمەش کارێکی دژوارە، چونکە خەڵکی دیکە زیاتر لەوەی کە هەن بە بەختەوەر دەزانین.

**مۆنتسکیو**(ریشەی تەواوی بەدبەختی‌یەکان): مۆنتسکیو فەیلەسۆفی سەدەی ١٨ فەرانسە دەیگوت: تەواوی خەڵک لە بەدبەختی دەترسن و هەڵدێن، بەڵام من لە ناهومێدی کە بنەڕەتی هەموو دەردێکە، هەڵدێم.

**مۆنتسکیو:** ملهۆڕ کەسێکە کە بۆ لێ کردنەوەی سێوێک، دارەکە لە ریشەوە دەردێنێ.

**مۆنتسکیو:** خودای مەزن ژنیشی وەک پیاو ئازاد خولقاندوە، لێی گەڕێن تا ئەم بوونەوەرە لەتیفەش کە پێگەیاندەری بلیمەتەکانی ڕۆژگارە، بە ئازادی بژی.

**مۆنتسکیو:** کەسێک کە بێ بیرکردنەوە قسە بکا، وەک ڕاوچی‌یەک دەچێ کە بێ نیشانە گرتن گوللە دەرکا.

**مهاتما گاندی:** ئیمان بە ئینسانیەت لە دەست مەدەن. ئینسانیەت دەریایە، وەچەند قەترەی پیس و ناپاک ناتوانێ دەریا پیس بکات.

**مادام کووری:** هەر دەردێک تووشی عەقڵ بێت، بزانە ئەنجامی خۆ زلییە.

**مارک تواین** (ئاخرین موشتەری): نووسەری ناسراو، بەر لەوەی بێتە نووسەر، لە ڕۆژنامەیەکی بچووکدا کاری دەکرد و لە موشتەرییەکانی ئەو ڕۆژنامەیە ڕۆژ بە ڕۆژ کەمتر دەبوو، هەتا ئەوەی ڕۆژێ جنازەیەکیان لە بەر ڕۆژنامەخانەکە دەبرد، مارک تواین سەرێکی لەقاند و گوتی: پێم وابێ ئەمە ئاخرین کەسێ بوو کە موشتەری ڕۆژنامەکەمان بوو.

**مریت ستانگی گونگدون** (فیلسوف و عالەم تەبیعی): چۆن دەبێ کە ئەم دونیایە بە هەمو نەزم و ڕێک و پێکیەوە دروست کرابێ، بە بێ ئەوەی کە کەسێک یان زاتێک لەم کارەدا بەشدار نەبێت و هەروەها ئەسەری نەبێت؟ چۆن دەبێت سەرەرای ئەم هەموو بەڵگە حاشا هەڵنەگرانە شوێنەواری (ذیشعور)ێک لە خولقاندنی ئەم دونیایە، نەبێت.

**مترلینگ:** زۆرکەس لە بەختەوەری دەگەڕێ، وەک کەسێک کڵاوی لەسەر بێ و لێی بگۆڕێ.

**مترلینگ:** زۆر ناخۆشە ئینسان لە حاڵی مەرگدا بێ و تازە زانیبێ کە هیچ نازانێ.

**مترلینگ:** دەزانن بۆ زۆرتر خۆ بە چارەڕەش دەزانین؟ چونکوو کەمتر ئاگامان لە بەختەوەری خۆمانە.

**مارک تواین:** دەڵێن بەهەشت لە ژێر پێی دایک دایە، ئەمن دەڵێم جەهەنەمیش هەروا.

**ئەسکەندەری مەقدونی:** ئەگەر باوکم ژیانی بە من بەخشیوە، مامۆستاکەم فێری کردووم چۆن ژیان بە سەر بەرم.

**مولیر:** شیوەن و زاری ئاسانە، بەڵام پێکەنین زۆر ئەستەمە.

**میکل ئانژ:** ئەوین شاباڵێکە خودا بە ئینسانی داوە تا بۆ لای خۆی بگەڕێتەوە.

**مووسە:** ژیان خەونە و ئەوین کاکڵی ئەم خەونەی.

**مینورسکی:** لای ئاسوورییەکانی چیا، گۆرانی کوردی وتن و چیرۆکی کوردی گێڕانەوە، بووەتە عادەتێکی گشت لایێ.

**دوکتور دەیوید مۆناگان:** لە ترسا مردن تەنیا قسە نیە، حەقیقەتە.

□

## پیتی ن

**ناپلئۆن بناپارت:** مردنی راستەقینە بـۆ مـرۆڤ، کاتێکـە هیـوای لـە دەسـت ئەدات.

**ناپلئۆن بناپارت:** مرۆڤی تێنەگەیشتوو، هەموو کات لـە رابـردوو قـسە دەکـا. تێگەیشتوو لە بیری ئێستەدایە و ئێستایش لە داهاتوو قسە دەکا.

تەگبیر و ڕاوێژ هەمیشە بە سەر شمشێردا زاڵە.

لە دونیادا لە یەک شت بترسن، ئەویش ترسە.

دایک بە دەستێک بێشکە رادەژەنێ و بە دەستێکی دیکەش جیهان.

دوگمەیەکم بدەنێ کارێک دەکەم کە خەڵک بیپەرەستن و گیانی خۆیـان لە پێناوی دابنێن.

ژنی پیاوسفەتم خۆش ناوێ، هەر وەک، پیاوی ژن سـفەتم خـۆش نـاوێ، هەر کەس لە دنیا دا بێ، دەبێ نەخشی خۆی هەبێ.

ناهومێدی، یەکەم هەنگاوە بەرەو گۆڕ.

گەورە پیاو ئەوکەسەیە، هەر کـات بیهـەوێ بتوانـێ لـە نـاو ئیحـساسات و ئەفکاریدا، مەودایەک دابنێ.

**نیزام وەفا:** پێبکەنە، بەڵام پێکەنینێک کـە بێتـە هـۆی گریـانی خەڵـکیتـر، پێکەنین نیە.

**نیزام وەفا:** لە بیر کردن سەر پۆشی هەموو خەم و خەفەتێکە.

**نیچە:** ڕابردوو ناگۆڕدرێ، ئـەوەی دەگـۆڕدرێ شـێوەی ڕوانـینی ئێمەیـە بـۆ ڕابردوو.

**نیکتین:** ئەدەبی کوردی لە پلەی یەکەمدا فۆلکلۆری کوردی‌یە، ئەو فۆلکلۆرە بەڵگەیە بۆ توانین لە ژیاندا و بۆ ڕەنگینی هێزی بەرهەم هێنان.

□

## پیتی و

**ویـل دۆرانـت** نووسـەری کتـێبی مێـژووی تەمـەدونی جیهـان: قورئـان بـە موسڵمانان ئەوەندە عیزەتی نەفسی داوە کە لە هیچ شوێنێکی جیهانـدا وێنـەی نییە.

**ویکتۆر هۆگۆ:** بێژی ڕۆژێ بێت کە لە موزەکاندا تۆپ دابنـێن و خەڵـکی بـە سەر سووڕمان چاوی لێبکەن و بڵێن ئەوە ئامرازێکە، بۆ لەناوبردنی مرۆڤ.

بۆ باوەڕ بە خودا تەماشـای مەلـێکی بچـووک بەسـە، کـە لـە سـەر دارێـک دەخوێنێ.

لە هەر کەسێکدا کە هومێد، تێکۆشـان، هیـواداری، کـەیفخۆشـی هـەبێ، فریشتەی بەختەوەری باڵی بەسەر دەکێشێ و بەختـەوەری بـۆ ئـەو بـە دیـاری دێنێ.

جێی سەر سوورمان نییە کە گەورەترین هۆی بە ئـاوات گەیـشتن لـە هـەر شتێکدا هومێد و ئیمانە.

هومێد لە ژیانی مرۆڤدا بە قەد باڵی باڵندەکان بایەخی هەیە.

بەختەوەر کەسێکە کە یەکێک لەو دوو شتانەی هەبێ، یان کتێبەکانی بـێ، یان دۆستانی ئەهلی کتێبی بێ.

بە ئاواڵەکردنی درگای قوتابخانەیەک، درگای بەندیخانەیەکتان داخستووە.

ئەو دەرونەی تێکەڵاوی درۆ و جەنایەت بێ، بۆ هەمیـشە ئاسـایش و هـێمنی خۆی لە دەست دەدا.

**وڵتێر:** ڕاستیت خۆش بوێت وەلێ ڕامەبوورە، لە هەڵە چاو پۆشە و خۆتی لێبوورە.

**وڵتێر:** لاپەڕەی کتێب وەک شاپەڕە، کە ڕۆحی ئێمە بۆ لای نوور و ڕووناکی دەخاتە هەڵفڕین.

**وڵتێر:** لە ئاوات و خواستی دوور و درێژ خۆ بپارێزن، چوونکە بێجگە لە ماندوویەتی ڕۆح و کەسەر باری دەروون، هیچی تێدا بەستە نییە.

**ویکتۆر هۆگۆ:** ئەڵماس لە قووڵایی زەوی و حەقیقەت لە قووڵایی بیر و ئەندیشەدا دەدۆزرێتەوە.

**حەزرەتی وەیس:** لە حەزرەتی وەیسی قەرەنی‌یان پرسی، حاڵت چۆنە؟ فەرمووی: حاڵێ چۆن بێ، کەسێ بەیانی نەزانێ ئێوارە زیندووە یان مردوو.

**واسیلی نیکتین:** ئەدەبیاتی کوردی لە فۆلکلۆری کوردی دایە، لەم فۆلکلۆرە نە تەنیا ئاسەواری پێشینیان دەبینردێ، بەڵکوو ڕێنوێنی و پەندێکی زۆری تێدایە کە لە سەردەمی ئێمەشدا شایانی سەرنج و بایەخە و ڕۆژ بە ڕۆژ بەرفراوانتر دەبێت.

**ویلیام شکسپیر:** سەرم سووڕ دەمێنێ لەوەی مرۆڤ قینی هەبێ، چونکە ئەگەر تەواوی ژیانی مرۆڤەکان بخەینە سەر یەک، بەشی تەواو کردنی تەنها خۆشەویستی یەک ناکات.

**وتەیەکی یونانی کۆن هەیە دەڵێ:** مەزنترین تاوانێکی ژن کردوویەتی، پیاوی هێناوەتە دونیا، کە بە خراپە نێوی ببات.

□

## پیتی ه

**مامۆستا هەژار:** بارزانی نە دەرەبەگ بوو نە کۆمونیست. نە سەر بەهیچ دەوڵەتێک بوو، دەیگوت: من خۆم بە نۆکەری میللەتەکەی خۆم دەزانم، هەتا دەستم تفەنگ دەگرێ بۆ ئازادی کورد دەکۆشم، من دەمەوێ ئاڵای

کوردستان هەڵکەم، نەهێڵم کوردستان چیتر یەخسیر و داگیر کراو بێت. بۆ پێکهاتی ئەم ئاواتەش تەنیا روس لە قازانجیانا لا گیرمان دەبن، تورکیا و ئێران و عێراق بە لە دەست چوونی کوردستان زۆر کز دەبن. ئەم دەوڵەتی رووسە زۆر (ڕەزیلە)، زۆر گرانە بکەونە سەر یاری دانمان.

**مامۆستا هێمن:** ئومێدوارم ئەم سرووەیە هەر بێ و هەر دڵان ببوژێنێتەوە و هەر گوڵان بگەشێنێتەوە، و هەر دڵی کوردان خۆش بکات.

**هانری هانیە:** ئەزموون حەکیمێکی شارەزایە، کە دوای نەخۆشین دێتە سەردانی نەخۆش.

**هانری کینیانس:** ئاسن لە ئاگردا قایم دەبێ، پەیدا دەبێ و تین پەیدا دەکا و دەبێتە پۆلا، مرۆڤیش لە ناو دەرد و کۆیلەتی و هەژاری هێزی ڕێگە و رەوشتی ئینسانیەت بە دەست دێنێ.

**هەرشل:** هیوا نانی ڕۆژانەی بێچارانە.

**ئیمام هادی:** تەواوی نەگریسییەکان بە گشتی لە هۆدەیەک کراون کە کلیلی ئەو هۆدەیە، درۆیە.

**هیرودت:** ڕاگرتنی دوو شت گەلێ ئەستەمە: ئەوەڵ کلکی ماسی، دووهەم: دڵی ژن.

**هۆگۆ:** ئازادی ئەوەیە کە هەموو کەس بە دڵ خۆی بە بێ زۆر، دەسەڵاتی یاسا بەرێوە بەرێ.

□

## پیتی ی

**یان ئیسکاسێل:** شاعیران داهێنەری شێعر نین، شێعر لەو قەراغ و قوژبنانە دایە، لە دەمێکەوە لەوێدا بووە، شاعیر تەنیا دەیدۆزێتەوە.

## بەشی چوارەم

# گۆرانی ڕەسەنی کوردی

وێنەی هونەرمەندی خوالێخۆشبوو قادری عەبدوڵڵازادە،

ناسراو بە (قالە مەڕە)

## گۆرانی کوردی

یەکێ لە دەوڵەمەندترین لقی کەلەپووری کوردی، گۆرانی یـە. مێـژوو روونی کردوەتەوە کە گۆرانی لە سەرەتای دەست پێکردنی ئادەمیزاد لە جیهاندا بـووە. و هەروەها روون و ئاشکرایە کە گەلانی سـامی، بابـل و کەلـدانی لـە نەتـەوەی کورد، فێری گۆرانی بوون.

بە داخەوە هەندێ لە گۆرانی بێژەکانی کورد، گۆرانی کوردی دەبەنەوە سەر ریتمی فارسی، تورکی و یان عـەرەبی، کـە ئەمـە جێگـای داخـە. لـە کـۆنترین گۆرانیەکانی کوردی ئەتوانین هۆرە، سیاو چەمانە و حەیران ناو بـەرین. گـۆرانی کوردی کۆنترین لقی فەرهەنگی کوردی یە.

**زانایان لە سەر مێژووی دەست پێکردنی گۆرانی کوردی دوو بیروړای جۆراو جۆریان هەیە:**

١ـ مرۆڤ هەر لە سەرەتای ژیانـەوە رووداوەکـانی ژیـانی خـۆی بـە گـۆرانی گوتووە و هەر لەو کاتەوە گۆرانی دەستی پێکردووە.

٢ـ گۆرانی لە کـاتی بـەرێوە بـردنی مەراسـیمی ئـایینی و موناجـات بـەرێوە دەچوو، کە نیازی دڵی خۆیان بە شێعر هەڵدەبەسـت و بـە گـۆرانی دەیـانگوت. وەک: گۆرانی دەروێشان لە کاتی زیکردا، چەمەری و هەندێ بابەتی دیکە.

لە گۆرانی، رووداو، کارەسات، باسی دڵداری، خۆشـی، ئـەوین، خۆشەویـستی تێیـدا دەبینـرێ کـە هەنـدێکیان فۆلکلـۆرین و سـینگ بـە سـینگ بـە ئێمـە گەیشتوون.

**شێوەکانی جۆراوجۆری گۆرانی بریتین لە:**

مەقام، حەیران، هۆرە، لاواندنەوە، لایە لایە، بەیت و بالۆرە، موناجات و بەزمی. کە ئەمانە هەموو بە شێوەی تایبەتی خۆیان دەگوترێ.

ئەدەبی کوردی لەگۆرانی گوتن بە زمانی کوردی یەوە دەستی پێکراوە، بەڵام بە داخەوە نەنووسراوە. جا پێویستە بزاندرێ کە گۆرانی کوردی شێعرە، سەرگوزەشتە، چیرۆکە، پێ هەڵاگوتنە، ڕێزگرتنە، بیر و باوەڕە، ئامۆژگارییە،کورت و کرمانجی شین و شادی و فەلسەفەی ژینی گەلمانە.

پێویستە بڵێین کە گورانی کوردی مێژوویشە،چونکوو ناوی زۆر شوێن و شوێنەوارە مێژووییەکان و هەروەها کەسایەتیە مەزنەکان و سەرۆک هۆزەکان و شەڕی ناوخۆیش لە گۆرانی کوردیدا هەن کە ئەگەر مێژووزان و زانایانی زیرەک هەبن، دەتوانن بابەتانی جۆراوجۆری لێ بخوڵقێنن.

گۆرانی کوردی ڕەوان بێژی زمانی پاراستووە.گۆرانی کوردی فەرهەنگی زمانی ئێمەیە. زۆربەی ئەو شتانەی کە لە بەر ستەم و هێرشەکانی دوژمننان ون بوون، لە نێو گۆرانییەکانی کۆندا بەرچاو دەکەون.

بە ڕاستی گۆرانی و گۆرانی بێژەکان، خزمەتێکی مەزنیان بە ئەدەب و زمانی کوردی ئێمە کردووە.

**مۆسیقای کوردی**

مۆسیقا لەسەرەتای ژیانەوە،لە گەڵ فیترەت و سروشتی مرۆڤ، تێکەڵاوی هەبووە و لە نێو هۆزە جۆربەجۆرەکاندا وێنەی تایبەتی خۆی بووە،لە درێژایی زەماندا بە پێی ژیانی هەر هۆز و گەلێک و بە پێی فەرهەنگ و جوغرافیا و مێژووییان،وێنەی جۆراو جۆری بەدەست هێناوە و تا ئەمڕۆ ئەو ڕێگاییەی پێواوە.

ئێستایش زۆرن ئەو هۆز و گەلانە کە شکڵ و وێنەی مۆسیقایان لە شکڵ و وێنەی سەرەتایی خۆیان نەچووەتە دەرێ و ڕەنگە هەر وەکو شکڵی سەرەتایی خۆیان بە کاری دێنن. لەو نێوە دا دەتوانین بە مۆسیقای هۆز و خێڵەکانی

ئافریقا، خەلکی ڕەسەن و خۆمالی ئوسترالیا، پێست سوورەکانی ئامریکا، کوردەکان و ... ئاماژە بکەین.

کوردستان بە هۆی هەرێمی جوغرافیای تایبەتی، و دژواری ڕێگای ناوچەکانی، تا رادەیەکی زۆر وەک خۆی ماوەتەوە. هەڵبەت نە لە تەواوی بەشەکانی کوردستان، بەلکو لە کوێستانەکان، چیا بەرز و بڵیندەکانی، زۆر ئاسەواری لێ بە جێماوە.

کوردەکان لە نێوان ئیمپڕاتوری جۆراوجۆر ژیاون، وەکو ئیمپڕاتوری ئێران،عوسمانیو تەنانەت رۆمی کۆنیش. ژینگەی ئەوان زۆرتر لەنێوان سەرسەوزی دوو روبار، واتە عێراق و سوریە وە هەروەها بەشێک لەرۆژهەلاتی تورکیە و باکووری رۆژئاوای ئێران بووە.

ژینگەی نەتەوەی کورد هەمیشە شوێنی شەڕ و کێشە بووە، بەڵام تەواوی ئەو سەر زەمینە داگیر نەکراوە، بۆ وێنە ناوچەی هەورامان بە هۆی ئەوەی سەر زەوی کوێستانی و ئاو و هەوایێکی تایبەتی هەیە، سروشتیە مرۆڤی هەستیار بە ڕق و غیرەت و دلاوەری لێ پەروەردە بێت.

کوردەکان بە ئازایەتی و مێوانداری ناوبانگیان دەرکردوە. ناوچەی کوێستانی ڕێگا و بانی ژیانی ئەوان و دوورە دەستی وڵاتەکەیان، بووەتە هۆی ئەوەی کە مێژووی فەرهەنگی نووسراویان نەبێت. بە رادەیەک پێوندی ئەوان لە گەڵ هۆز و گەلانی دیکە زۆر کەم بووە.

هەمو شتێکیان بەشێوەی سینگ بە سینگ هاتووە و مۆسیقاکەیشیان بەو هۆیە رەسەنایەتی خۆی پاراستووە. هەروەکو لەسەرەوە ئاماژە کرا، کوردستان لەسەر سنووری چەند وڵات هەلکەوتووە و هەر ئەوە بووەتە هۆی تێکەڵاویەکی زۆر لەنێوان مۆسیقای کوردی و مۆسیقای ئەو گەلانە.

مۆسیقای کوردی بە پێی کەش و هەوای ناوچە و تێکەڵاوی لەگەل فەرهەنگەکانی دیکە، ملۆدی و راراوە گەلی جیاواری هەیە. بۆ وێنە هەواکانی

کوێستان لە گەڵ هەواکانی دەشت جیاوازییان هەیە.نەغمەی ناوچەی کوێستانی،غەمگینە و نەغمەی ناوچەی دەشت شادە، بەڵام لە ڕوانگەی ناوەرۆک و شێعر،پەیڕەوی لە کێشی هێجایی دەکەن.

مۆسیقای کوردستانی عێراق لە گەڵ کوردستانی ئێران و تورکیە، لەڕوانگەی ریتم و ملۆدییەوە جیاوازی هەیە. تەنانەت لەکوردستانی ئێرانیش ناوچە جۆراوجۆرەکان، مۆسیقای جۆراوجۆری هەیە. بۆ وێنە مۆسیقای هەورامی لەگەڵ مۆسیقای ناوچەکانی مەهاباد،سەقز و کرماشان جیاوازییان هەیە.

**گۆرانی بۆ خۆی لە دوو بەش پێک هاتووە:**

بەشێک بەناوی"مەقام" و بەشێکی دیکەی بە ناوی "بەستە".

مەقام بە جۆرێک بە داهەخوانی یان بە داهەنەوازی کە لە سەر چوارچێوەی ملۆدییێکی دیاری کراو دانراوە، دەگوترێ کە لە هەر خوێندنێکدا گۆرانی هەیە و جۆراوجۆرە،لەئاکامدا خوێنەر لە خوێندنی مەقامدا دەتوانێ بە پێی زەوق و زانایی خۆی بە کەڵک وەرگرتن لە تەحریرەکان و ڕازاندنەوەی ملۆدی، ریتم و فۆرمێکی تازە و نوێی لێ نیشان بدا.

مۆسیقای مەقامی لە مەقامی کوردیدا هەر وەکو مەقامی وڵاتانی دیکەی ڕۆژهەڵات، کەڵکی لێ وەردەگیرێ.شێوەی خوێندنی مەقام هەر وەکوو شێوەی خوێندنی ئاوازە، هەر مەقامێک ناوی خۆی، لە ناوەرۆکی خۆی وەردەگرێ، وەکو: مەقامی هیجرانی، مەقامی خورشیدی و ... هتد.ئەو مەقامانە لەفارسیدا هەیە و لەکوردیشدا هەر وەهایە، بەڵام نە بە شێوەی فارسی ناویان لەسەر دانرابێت.چۆنیەتی خوێندنی ئەوانە، هەر وەکوو مەقاماتی فارسی پێویستی بە تۆێژینەوە و لێکۆڵینەوە هەیە.

"بەستە" لە کوردیدا بە مۆسیقایەک دەڵێن: کە حالەتی ریتمی هەبێت و وێنەی لەفارسیدا تەسنیفە.ئەو تەسنیفانە جۆراوجۆر بە کار دەبرێن. و لە

مۆسیقای بەزمی،بەستەی شادی پێ دەڵێن. سەر جەم هەر چەشنە مۆسیقایێک کە حاڵەتی زەربی هەبێت، دەتوانین پێی بڵێن، "بەستە".

هەوەڵین ئاکاری بەرێوە بردن، کە بەشێوەی وتاری مێژوویی رووی داوە لە کۆمەڵێک بە ناوی بەیت ناو نراوە.ئەو بەیتانە بەسەر هاتێکن کە رووی داوە بە شێوەی ئاهەنگ لە مەقامی جۆراوجۆر دەخوێندرێن. ئەو بەیتانە بە ناوی خێڵاتی جۆراوجۆری کورد هەیە، کە بابەتی شەڕو خەبات،تەنانەت بابەتی ئەوین و ئایین بە خۆییەوە دەگرێ. وەک بەیتی: مەم و زین، لاس و خەزاڵ، خەج وسیامەند، بەیتی سام سام و...هتد.

لە نێو ئاغاوات و دەرەبەگی کورددا، وا بووە کە پیاوێکی دەنگ خۆشیان بە کرێ گرتووە کە بە دەنگ خۆشی ناودار بووە. هەندێ جار چەند کەسیان لەم پیاوانە بە کرێ دەگرت و پێیان دەسپاردن بچنە ناوچە جۆراوجۆرەکانی کوردستان و ئاوازە پەسەند کراوەکانی وەکو بەیت، کۆ بکەنەوە.ئەو ناردراوانە بابەتی ئەم بەیتانەیان لە بەر دەکرد،بە ڕادەیەک تێدەکۆشان کە تەنانەت وشەیەکیان بەجێ نەدەهێشت و هەرچۆن کە خوێندرابوو، دەیانهێناوە بۆ ئاغەواتیان دەگێڕایەوە.

مۆسیقای ئایینی جۆری تایبەتی خۆی هەیە و لە شوێنێکی تایبەت دەخوێنرێ. مۆسیقای دەروێشەکان لە خانەقادا دەخوێندرێ و سازی ئەوان زۆرتر دەفە، کە خوێندنی لەگەڵ ریتم و سەمای دەروێشان تێکەڵە.

مۆسیقا جۆراوجۆرەکانی کوردی کە لەگەڵ گۆرانیەکاندان، بریتین لە:گۆرانی کاکە شوان، جووتیار، هەروەها ئایینی لە مەدحی یەزدان وپیاوچاکان و.... هتد. وەکو: هۆرە، دەروێشی، گۆرانی بەزمی و رەزمی،عاشقانە،منداڵانە،ژنانە. کە لە کاتی شیر دۆشیندا دەیڵێن یا وەختێک کە پێش تابوتی لاوان دەکەون و دەگرین. هەروەها پارشێوان بۆ ئاگاداری کردن لە مانگی موبارەکی رەمەزاندا دەگوترێ کە پێی دەڵێن "سەلا".

حەیران: جۆرە مۆسیقایەکی کوردی یە،کە بە وێنەی تایبـەت دەخـوێنرێ و کەسێک بە تەنیا دەیخوێنێ و زۆرتر بابەتی ئەوینی تێدایە، کە لەهەر ناوچەیەکی کوردستان،بە پێی مەرجی تایبەتی ئەو ناوچەیە، دەخوێندرێ.

حەیرانۆک: هەر وەکو حەیرانە، بەڵام بە زاراوەی کرمانجی دەخوێنرێ.

لاوک: ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی‌یە، کە باسی شەڕ و خەبات و ئازایەتی دەکا.

لێ لێ: وتو وێژێکی مەقامیە، لەنێوان دوو دڵدار دەگوترێ.

هۆرە: جۆرە گۆرانیێکـە لـە مـەدحی ئەهورامـەزدا، دەخـوێنرێ و زۆرتـر لـە ناوچەی کەڵهوڕ و بەشێک لە هەورامان دەخوێنرێ.

"گۆرانی یەکەم شوعلەی هونەرە"

□

## لاوک

جانێ بە من جانێ
سینگی سپی یە، مەمک فنجانێ.
کەوا غەزەلێ، عەبا بەڵەکێ، سەرپۆش کەتانێ
بەوان ئەستێران هەڵدێن، لە روو ئاسمانێ
بەوان گەورە کیژان دێنە دەرێ، لە ماڵێ خانەدانێ
ئەرێ دە لای لۆ دە لای لۆ
کەڵەشێرێک دەخوێنێ، لەو سەری گەڕەکێ
کەڵەشێرێک کە دەخوێنێ لەو سەری گەڕەکێ
کەڵەشێرە ئەگەر سووری، ئەگەر سەوزی،
ئەگەر مۆری، ئەگەر ڕەشی.
سەدان لە ماڵی خاوەندی هەڵ نەهێنی
هیچ جاران بە خۆشی.
وەک هەموو ڕۆژێک، هەتیم لاوەکەی من بەر لە بەیانی
لە سەر سینە ومەمکۆڵەیەکی ناسکو نازدار لە شیرین خەوێدا رادەپەڕێنێ
ئەڕێ دە لای لۆ دە لای لۆ
ئەمما کوڕ دەڵێ:مەجەلێکم لێدەگەرێتەوە
نازانم شەوە یا نێوە شەو
کیژ دەڵێ: کوڕە ماڵ وێران
من ئەوەندەی دەزانم بەری ڕۆژ لە من زەردە
دەست لە شەمامە و شەمامە رەنگینی باخەڵێ من بەردە.
نەکا گولەیەکی مێردان بێتەوە لە دەردا
بە دەستێکی دارە، بە دەستێکی بەردە

ئەگەر چ زەبران بە تۆ بگەیەنێ
من لە کن دایە و بابەکانی خۆم ئەبمەوە خەجاڵەت،
خەجاڵەت باری یە
لە کن دایە و بابەکانی تۆش ئەبمەوە روو زەردە.

□

حەیران

حەیران حەیرانەکەی من حەیرانت لێ دێ
گەردنی زەردە مەرجانت لێ دێ
ماچی ئەوان شلوملان، چاو پڕ لە کلان،
گەردن کێلان، قۆڵ بە بازنان
ئەوەڵیان تامی شەکرەکەی شارانی لێ دێ
دوایمیان بۆنی خونچە گوڵەکەی بەهاری لێ دێ
جوانێ وەرە بە جوانیەکەی خۆت مەنازە، مەڵێ من جوانم
ئەگەر تۆ کچە قازی، منیش کوڕە لوقمانم
ئەگەر تۆ ناقایلی سەد جاران، منیش پەشیمانم
دەڵێم حەیران، وەرە لە سەری بەندەنێ
پەرچەمت گەڵێ زەردە مەیاندە لە خەنێ
ئەمساڵەکەی نوێ پایزێ، ساڵەکەی گەڵەک نامەردە
من ئەچمە دەرێ لە کاولە وڵاتێ، ئو باڵەکەی منت
بە ئەستۆیە بێ
پاشی من جووتەی شەمامە ڕەنگینی باخەڵت،
لە دەست کەس مەنێ
ئەستێرەیەکم لێ هەڵدێ لە"بەنێ"
ئەستێرەیەک کەم لێ هەڵدێ لە بە ناو بەنێ

ئەستێرەیەکم لێ هەڵدێ لە گەڵکی"دارەبەنێ"
ئەمساڵ حەوت ساڵە بەژنێ باریک لە سەر ماڵێ بابانی
بە بێ مارە و تەڵاقە.
چ خۆشکم نین لەداو بابەکانی خۆم بیدەم لە تۆڵەی مارە بڕینی.
هەڵ دەدەم زێڕ بە کۆششی، دراو بە لەگەنێ.
ئەما بە ماڵەکەی دنیاشم نادەنێ
ئەمن دەڵێم حەیران، حەیرانەکەی من زێدە
قەدی چەند شلە کەمبەرەی تێدا.
بازی دەوڵەتی خۆی لە کەوێدا
ماچ کردن گەلێک خۆشە لە گەڵ دۆستی بە دڵی خۆت
لە شیرین خەوێدا
گەڵێ برادەرینە و گەڵێ برادەران، ئەمن برینداری برین لە ناسکەی بەدەنێ
بۆ برادەرێکی جانی خۆشەویست خەبەرێکم بۆ بەرێ
بۆ بەژنێ باریک
دەستی مەڵحەمم بۆ بگەڕێتەوە
لە ئارەقی قولکێ بەر گەردەنێ
بەر لە شۆڕا بی گوارێ کە من بیخەمە سەر زاری برینان
نەیەشێ لە من کاتەوە ژانێ.
بەڵام کیژ دەڵێ:سەری خۆم ئەکەم بە غولام و خزمەتکاری
سەری ئەوان دوختەران حەکیم و لوقمانان
دەست نەکەنە برینی هەتیم لاوێ تا بۆ خۆمی دەگەمێ
دەستە مەڵحەمێکم بۆ گرتۆتەوە، لە ئارەقی شرومەکان
لە زەریتی گوارێ
ئەیخەمەوە سەر برینی کوڕە حەیرانەکەی خۆم

نەیەشێ و نەکاتەوە ژانێ.

□

## " گۆرانی فۆلکلۆر "

راوەستا لە بەر دەرکێ کلەی لە چاوان دەتکێ
چبکەم دە قیمەت نایە بۆتە کەولی دەلەکێ

□

ژنم لێ بوو بە قاتی هاتم تووشی نەهاتی
چبکەم دە قیمەت نایە بۆتە ڕۆنی نەباتی
ناچارم هەڵی بگرم با بمکوژن لە باتی

□

ئەگەر راستی دەپرسی داینێ هیچی پێ مەکە
پاڵە و پشتی بۆ دانێ جار جار سەر کولمەی ماچکە
کا حەسەن لەگەڵ تۆمە نۆکەری خۆت خەڵاتکە

□

راوەستاوە لەو سەرە خۆی پێ کوڕی قەیسەرە
دەس بۆ گیرفانی نابا سوبحانەڵلا چەند کەرە
هاتووە لە لای سێلەکە گاوانە یا مەیتەرە

□

راوەستاوە لە بێلایە دەنگی لە بەر دەرنایە
هێندە جوان و لەبارە چاوی لە بەر هەڵنایە
هەر ئەو ئیرادەی هەیە لووتی دەڵێی زوڕنایە

□

ڕێگەی هات و نەهاتی پێت پێوەنا هەڵاتی
خۆت لە بەر بەندم نەگرت قەڵس بووی بۆ دەهاتی
بێدەنگ و کز و ماتی دەڵێی قەند و نەباتی

□

لاوە هـــــەی لاوە، لاوە هـــــەی لاوە    بـۆ ڕەزای خـودا، ڕوو بکـه بـەم لاوە
ئەگەر گیان کێشان وەک دووری تۆ بێ    یا خودا بە نسیب گاوری سەر کۆ بـێ
سەران چوون هەوری،پاوان چـوونپـاوە    خۆ تۆ بەهەشت نی، بـه ڕووی دونیـاوە
سەر سەوز و بۆرچین نیشتن لـه دەریـا    سەر سەوزم دەگرت، بۆرچین ما،تـەنیا
گـەدایی دەکـەم لـه لای خـودا بـێ    بەشـکەم کۆچەکـەی بـەرەو دوا بـێ
گـەدایی دەکـەم لـه لای خـودا بـێ    ئـەو مالـەی هەمـە نـەزری ئەلـلا بـێ

□

ئەگەر من مردم بۆ من مەکەن شـین    پشتم لـه قیبلـه و ڕوو لـه نـازەنـین
بە حەسرەت یـارم لێمیـان سـەنەوە    ئەوە مـن مـردم هـەر بـەو داخـەوە
ئەگەر مـن مـردم وەسـیەتێ ئەکـەم    تالێ لەو زولفـه بخـه نـاو کفنەکـەم

نەکا لە قیامەت بەین بەین یادت کەم

□

شەرت بێ لە داخت مـردم نەیمـەوە    وەک بارام لە شوون گـوڵ ئەندامـەوە
لە دوای مردنم تێر بۆم بکـەن شـین    منبوومەفەرهاد ئەویش وەک شیرین

□

ئەی خاڵەی ڕێبوار، ئەمنیش ڕێبوارم    منـیش وەکـو تـۆ دڵ بریـنـدارم
ئەوەنـدەم مـاوە، بمـنێ لـه گـوێزێ    نه چـاو تێردەبـێ، نـه دڵ دەبێـزێ
ئەی خاڵەی ڕێبوار، ڕێگـام هـەورازە    موبارەکـت بـێ، ئـەلمۆدەی تـازە
خـۆ مـن گـوارە نـیم، بـه تـەلارەوە    لەگەڵ ئەگریجـەت بێمـه خـوارەوە
ئەی خاڵۆی ڕێبوار، ڕێبـواری ناکـەم    لە پـاش بالـاکەت، دلـداری ناکـەم
ئەوەندەم ماوە بمخـەی لـه قەفـەس    نه چاو تێر دەبێ، نه دڵ دەڵێ بەس
خۆ من گەلـا نـیم بـه گـوێ بانـەوە    بچمـــه ئەگریجـــەی خەرامانـــەوە

بێـــوەژن بێـــنم بە خێزانەوە

□

ئەی خالۆی ڕێبوار ئێسرەکەت بـــۆزە  وەرە بـــا بیکـــەین جەژنـــە پـــیرۆزە
هــەتا خــۆم کــوڕ بــووم بــە بانانــەوە  بـــــەرتیلیان ئـــــەدا ئەپارانـــــەوە
ئێـــستێ ئـــاوڕم لـــێ نادەنـــەوە

□

ئەی خالۆی ڕێبـوار، ڕێبـواری ڕێگـا  مـــەڕۆ بـــەرێوە وەرە ســـەر جێگـــا
ئەمنیش ڕێبوارم بـێ کـەس و کـارم  هەمیـــشە وەک تـــۆ دڵ برینـــدارم
ئەی خالۆی ڕێبوار ڕێم لـێ گـۆڕاوە  بمخـــە ســـەر ڕێگـــا ســـەرم شـــێواوە

□

ئەو کچە لەو ماڵە قـەولی داوە پـێم  دەرک و دەروازەی داخـــراوە لـــێم
ئەو کچە لەو ماڵـە خـۆی دا نیـشانم  ئاوری پـێ نـەبوو سـووتاندی گیـانم
ئەو کچە لەو ماڵە جوان وەک هەڵاڵە  هیچ لۆمەی مەکەن دڵ بۆی بێحاڵـە

□

خـــەم و تـــەم لـــە ســـەری مـــن  هـــەر وەک کێـــوی دەماوەنـــد
تـــازە بـــێ تـــۆ حەرامـــە،  بـــۆ مـــن ســـەیری زەماوەنـــد

□

حالێ من هەمە، یاخواکەس نەی بێ  چـاوەڕێی مـەرگم نـازانم کـەی دێ
بە سەرگەردو بم، شـۆخی گـەڕەکێ  چاو لە سەر هەزار، دڵ لەسەر یـەکێ
بـە سـەرگەردو بم، بازەکـەی ڕاوی  مـەگرە ڕەمـەزان، زەرد هەڵـگەڕاوی
ئەترســـم بمـــرم نەتبینمـــەوە  بـە جوانـە مـەرگی سـەر بنێمـەوە
ئەوە مانگ هەڵات مانگی یەکـشەوە  لـە کێـو و شـاخان چریکـەی کـەوە
ئامین و ئـامین تـۆی دونیـا و ژینـم  قۆڵـەکـەت دانـێ بیکـە سـەرینـم

□

ڕۆژێ ئەگـــەر نـــەتبینم، غـــەرقی ئـــاو ئـــاورم
یـاخوا قـەت لێـت دوور نـەبم، بـێ تـۆ ئـارام نـاگرم

شــــــەرتە مەیلەکــــــەت دەر نەکــــــەم لــــــە دڵ
مەگــــــەر ئــــــەو ڕۆژەی بم نێنــــــە ژێــــــر گــــــڵ
بــــــە بۆنــــــەی تــــــۆوە لــــــەم شــــــارە وێــــــڵم
چــــــۆن دڵــــــم دێــــــڵێ، تــــــۆ بــــــە جــــــێ بێــــــڵم
لــــــەو کاتــــــەوە لــــــە تــــــۆ دوور کــــــەوتم
دڵ پــــــڕ لــــــە خــــــەم، کاتــــــێ نەســــــڕەوتم
ئــــەو قورئانــــەی بتگــــرێ هێنــــات لێکــــت کــــردەوە
ســـەد جــار دەســتتپــێ دادا، بــۆ مزگــەوتت بــردەوە
بـۆ خـۆت کـەیفم بـۆ دەکـەی بـە گـەردنی زەردەوە
ئەمنیشت ماڵ وێـران کـرد، بـە هەناسـەی سـەردەوە
دەبرۆ لە من حەرام بی، هەر وەک شەراب لە شـێخان
هـیچ قـەولی راسـتت نیـە، غـەیری درۆ و تـەفرەدان
دەفـەرمووی بـۆ تـۆ نـابم، چـۆنی دەڵـێی تـا وا بم
کەوتومــە وڵــاتی زاری، بــە یــادی تــۆوە مــاوم
ڕەبی کۆستی دڵ کەوێ، گەر سـاتێ لێـت دوور مـاوم

□

هەرمن کەس نەبوو شەو لە دیارم بێ
گوێی لە هاواری دڵـەکەی زارم بـێ
گوڵی زەردوسوور، سلێمان بەگی بانە
بـە وێنـەی نییـە لـە رووی جیهانـە
بەتفـەنگی بـڕناو بانـە چـۆڵ ئەکـەم
ئەم شەڕە لە سەر باڵای تـۆ ئەکـەم
من چبکـەم وەدەس بـاری خەمـەوە
گۆشەی دڵ لە لای کـێ بکـەمـەوە

□

گۆزەی سووری سەر شانی یارم هـاتۆ لـە کـانی
لە بەر ئەو گۆزەی ئەمرم یارم دینێتە سەر شـانی

لاوە هەی لاوە، تخوا بەرکە بم لاوە
منت کوشتووە بە غەمزەی ئەو دوو چاوە
هەر کەسێ بیکا مەنعی ئەمن و تۆ
لە ماڵی بمرێ بە هەشت و بە نۆ
ئەتۆ لەو ماڵە، لە حوجرەی حەوت ڕەنگ
ئەمنیش وام لێرە، غەریب و دڵتەنگ
هەر کەسێ نەیبێ دوو دوست و یارێ
سەر بنێتە قوڕ سوبح و ئێوارێ
ئەترسم بمرم بە چلەی زستانێ
قەڵ و داڵ بمخوا، کەس پێم نەزانێ
جارجار بە رووی ناز ئاشتی ئەبردۆ
هەر وەک گوڵباخی رووی ئەکردۆ
سەیر کە ئەو دڵە و بڕوا ئەو لێوە
تا وەختێ لامی خەم لە من دوورە
لە ڕێگای قوتابخانە، کەم پێم بگرە بەهانە
خۆ من کوفرم نەکردووە، ئەڵێم ئەو کیژە جوانە
لەو ڕۆژەوە دوور بووە سایەو لە سەری من
کەوتووەتە ناو دەریایەوە، لەعل وگەوهەری من
پرسیم لە سیروان بۆ وا لێڵی
بەهار و پایز جێی بارگای خێڵی
ئەی داد هەی بێداد کەس دیار نیە
کەس لە دەردی من ئاگادار نیە
ئەی داد هەی بێداد خۆ من نەماوم
وەکو جگەری داڵێ بێ خوێن دەڵێ بە جیاوم

ڕێگاکەم دووره مەنزڵم کوێستانه
شەو دێ بە سەردا، یارم میوانە
ئەی داد هەی بێداد کەس دیار نییە
کەس لە ناڵەی من خەبەردار نییە
ئەی داد هەی بێداد لەم دەوره دیلە
هەر جوانێ بە دەس پیرێ زەلیلە
مەڕۆ لە لای من، بە جێم مەهێڵە
عاشق بە بێ تۆ هەمیشە وێڵە
مەڕۆ لە لای من، ئاشتم کەرەوە
ئەم شەو لە لای من ڕۆژ بکەرەوە
مەڕۆ لە لای من، بە جێم مەهێڵە
بۆ لای تۆ هاتووم، لە ڕێگەی دوورەوە

□

هەناسەی ساردم سەنگی تاوانۆ
گاوری سەر کێوان منی لاوانۆ
قبلەی حاجیان لە لای شامەوە
قبلەی من هەر تۆی، لە پەنامەوە

□

شەرتە گوڵی کەس نەکەم بە بۆوە
ئەگەر بە بێ‌تۆ سەر لە سەرین کەم
ئەگەر نەبوایە بە بۆنەی تۆوە
خەنجەرێک بێنە سەد زامم تێکە
بۆ من لە جوملەی عەبدی خودا نیم
شەوان ئەخەوتم بە ئاسانەوە

تا گوڵم بۆ دێ لە لایەن تۆوە
لە نیوە شەودا، دەست بە ناڵین کەم
ئەمن چیم ئەکرد بە کەژ و کۆوە
زام لە بانی زام دەرمانی تێکە
سەعاتێک لەدەست مەینەت ڕەهانیم
بۆم تەنها بە بۆی هەناسەتەوە

من دووروتۆدوور،بێ بەینێک بەستین — بە فرمێسکی چاو جۆگە هەڵبەستین

بەو مانگەی قەسەم خەرمانەی داوە — هێشتا مەیلی تۆم بە کەس نەداوە

سەوزەلێ‌سەوزەگیان،باریکەی منداڵ — وێنەی خاسەکەو، تازە رشتووتە خاڵ

وەنەوشەم ئەچنی مەڵۆ بە مەڵۆ — خەلکی‌پێ شادبوون، منیش ڕەنجەڕۆ

□

ئەستێرە ئەبژێرم شەوێ — خەو بێ و لە چاوم ناکەوێ

دڵ مەجنوونە و لەیلای دەوێ

چاوت ڕەشە بە خومارەوە — مەمکەت سێوە بە دارەوە

خودا داویە مەی شارەوە

□

چاوت ئەستێرەی گەشە — بۆچ لێم دەکەی هەڕەشە

کوفرێکم لێ واقیع بوو — بە جوانیەکەت بم بخشە

ئەو چاوانەی هەڵیان دێنی — بە کلەو دەرمان ئەی ڕەنگێنی

ڕۆژ نییە مردووم لێ نەمرێنی

□

شەوەکەی عازەڵ نەبووای بە یارم — نەبوای بە باعیس دلەکەی غەمبارم

کلۆنجە ڕێ ڕێ دەسماڵ پەشمینە — لە دووری باڵات ئەو دڵەم غەمگینە

□

خۆ من چەمی کەڵوێ نیم — دێتە خواری لە لەندێ

بەفراوی چاو دەرێژێ — هەر وەک کێوی سەهەندێ

عاشقی باڵای کیژێکم — سینگی کارخانەی قەندێ

□

گلەیی دەکەم بە لای خوداوە — دەروازەی مەینەت بۆ من کراوە

چاوان مەرێشە هێشتا منداڵی — سێوی نەگەیو هەڵوژەی کاڵی

یا خوا هەر شەو بێ لە ڕۆژ بێزارم — دەستم نەبێتۆ لە گەردنی یارم

ئەگەر دەپرسی لە دووریت چۆنم — بۆی کزەی کەباب دێت لە دەرونم

تازەم زانیوە مەریوان دەشتە — ماچی گەورە کچ، نیوەی بەهەشتە

من دوور وتۆ دوور، بە دووریت قەسەم — ئاوری دووریت بەر بوو، لە جەستەم

دەترسم بمرم قەورەکەم غار بێ — ئیزائیل لە دەست نالەم بێزار بێ

دەترسم بمرم نەگەم بە مورادم — یار بێت بە حاکم نە پرسێت دادم

دەترسم بمرم بە چڵلەی زستانێ — جانەوەر بمخوا کەس پێم نەزانێ

دەترسم بمرم نەت بینمەوە — بە جوانە مەرگی سەر بنێمەوە

تاکەی دانیشم لە سای داری بی — تاکەی بیکێشم ڕەنجی غەریبی

ئاوا من دەڕۆم بۆ وڵاتی روم — پرست پێ ئەکەم بڕۆم یا نە ڕۆم؟

□

ئەگەر ئەمزانی قەوڵەکەت وایە — دا دەنیشتم لات، هەتا هەتایە

دەس و بازنەکەت خرنەی لێوۆ دێ — تلسمی عیشقت کێ بیشکێنێ

سەڵامێک لەخۆت دووسەد لەدایکت — سێسەد لەوکەسەی بریویە ناوکت

شەرتە بیپۆشم بەرگی ڕەش دەوار — بە شوێنتا وێڵ بم هەوار وهەوار

دەروێشم تۆبەکارم، — گوێ بگرە لە هاوارم

کەوتومە داوی عەشقت — ئیتر نابێ رزگارم

□

دەچمە سەر سوڵتانی شەمۆیە نایەمەوە

دەس لەکێڵان وەردێنم چڵ دانەی دەگرمەوە

بەختی خۆم و لێو ئاڵی پێ تاقی دەکەمەوە

□

قەسەم بە ڕەحمان و ڕەحیم — هەتا لە دونیایێ دا بژیم

مەیلت نانێم یاری قەدیم

□

کــاری مــن نیــە کــاری خودایــە    لەیلا دەوڵەمەند، مەجنوون گەدایـە
هەر چەند دەکـەم فکـر و ئەنـدێش    تـەوەلا بـووم، لـە قـەوم و خـوێش
لــە ســوێی باڵــات بــووم بــە دەروێــش

□

کوڕم گەورە کرد بە قەنـدی شـاری    ڕەزاشــا بــردی لــە بــۆ ئیجبــاری
یا خوا پەهلەوی تـەختی وەرگـەڕێ    ئیجبــاری کــوردی دەبـا بـۆ شـەڕێ
بــەهارێ نــەمرم مــانگی گوڵــانە    هاوینــێ نــەمرم خەڵــە و خەرمانـە
زســتانێ نــەمرم بــەفرو بارانــە    پــایزێ بمــرم دەس لێــک بەردانـە
چەند شاران گەرام چەند خاکەساری    بووم بـە شـوانەکەی حـەق نادیـاری
هەر کەسێک بیکـا غـەریب نـەوازی    خودا و پێغەمبەری لێـی دەبـن رازی
غەریب لـە شـاران، غـەریب دیـارن    جێگـای غـەریبان گۆشـەو کـەنارن
دیـسان شـەو هـات بـۆ حاڵـی مـن    بــۆ دڵــەکەی پــڕ خەیاڵــی مــن
گەڕەک نـا نـوێ لـە ناڵـەی مـن

□

نە خودا دەمکوژێ نە گەنجی دونیـا    باڵــای تــۆم دەوێ بــە تــاقی تــەنیا
نە خودا دەمکوژێ نە بۆ خۆم دەمرم    چونکا غەریبم کـەس نـاگرێ قـەدرم
نە خوا دەمداتێ مەرگێک بە ئاسـان    نـە دڵ لـە لای تـۆ دەبـێ هەراسـان
وەک قــومری ســەر باڵــی شــینە    دەچــــریکێنم بــــەم هاوینــــە
کــار و پیــشەم هــەر ناڵــینە

□

ســـەفەرێکم کەوتــــە بــــەر    ڕێگــــەی هــــاتو نــــەهاتێ
چاوەڕێمــــە لــــە ڕێگــــا    بــــا کــــاروان بــــێ و بگاتــــێ
نــە دەردم وەکــوو دەردە دارانــە    نــە بــرینم وەکــو و بریندارانــە

تاکـەی دانیـــشم لـە بـن دیـواران ئاخ هەڵ بکێشم وەک لێـو بـە بـاران
هاتنـــەوە تـــەیری دە گـــەرمێنێ هێـــــشتا دوورە و دەخوێنـــــێ
دەمـــرم دەبـــەر ئـــەو تـــەیرەی مزگێنـــــی بـــــەهار دێنـــــێ

□

## وردە مەقام

فەســـڵێک دەخـــوێنن یاســـینم لـــــەیلا بێننــــە ژوور ســـــەرینم
کوێـــت دیـــشێ،دیدەی شـــیرینم
تـــۆ خۆڵـــا، لـــەیلا وەرە کـــنم بـــــە دڵ ئـــازا بکـــــە گـــــەردنم
نیزیکـــــــــە ڕۆژی مـــــــــردنم
یـا خـوا هـەر وا گـەرد و تـۆز بـێ دەســـرۆکەی لـــە مـــلان ئالـــۆز بـــێ
لـــەیلا جێژنـــت لـــێ پـــیرۆز بـــێ
قوربانـــت بم ئـــەی بـــای شـــەوێ کـــە جـــار جـــار رووی دەردەکـــەوێ
پێـــی خـــۆش دەبـــێ مـــاچی شـــەوێ
دیـسان شـەو هـات بـۆ حالـی مـن بـــۆ دڵـــەی پڕخەیالـــی مـــن
عالـــەم ســـووتا بـــە نالـــەی مـــن
قوربانـــــت بم ئـــــەی بولبولـــــە دەم لـــە ســـەر خونچـــان هەڵـــگرە
سیـــست کـــردن مـــاڵ کاولـــە

□

ئـــەتۆ وا دەڕۆی بـــە نـــارەزایی دڵ خۆڵات لەگەڵ بـێ مـەنزڵ بـە مـەنزڵ
ئەگەر بە بێ تۆ سەر وە سەرین کـەم دوو ڕۆژ پێ ناچێ دەس بە نالین کـەم
دەترســم بمــرم، دونیــای زۆر مابــێ بەد کاری بێ پیر، بـە لـەیلام شـا بـێ
باڵـا بـەو بـەرزی قـەد بـە باریکی ئەســتێرەی سـوهەیل کەوتـە تـاریکی
مـــوژەت نیـــزام و ســـەر عەســـکەر لـــە ســـەر چـــاوان بەســـتیان لەنگـــەر

لنگیـــان دامـــێ دەســـتەو خەنجـــەر

چـــــاوت ئەســــــتێرەکەی ڕۆژێ هەڵـــــدێ دەگــــەڵ گەڵـــــاوێژێ

قەســـتیە بــــە نــــازان بمکـــوژێ

چـــاوت ئەســـتێرە کـــۆ بـــە کـــۆ نـــە دڕەنـــگ هەڵـــدێ گیانـــە نـــە زوو

لـــەیلێ ڕوویـــی مـــەجنوون لـــە دوو

چـــاوت ئەســـتێرەی ســـەحەری هەڵـــدێ لـــە بێژنـــگ بـــە ســـەری

کوشـــتمی قەتارەکـــەی ســـەری

چـــاوت ڕەشــــە، لەگـــەڵ بـــرۆت بـــەو خاڵـــەی کـــەم، دەورەی لیمـــۆت

دایکـت مـاچ کـەم، یـا نـە خـۆت

قوربانـــــت بم ئـــەی بـــای وادە تـــارا لـــــە ســـــەر لـــــەیلم لادە

بــــە دەســــتووری حــــاکم زادە

مەجنوونەکــــەی لــــە کێــــوانم دڵ پــــڕ لــــە دەردی هیجــــرانم

بـــۆ خاڵـــی لـــەیل پەرێـــشانم

خۆزگــــەم بـــە فـــەرهادی چینـــی خەریکــــە لــــە ســــەنگ تاشــــینی

ئــەویش بــۆ عیــشقی شــیرینی

قوربانـــــــت بم، شـــــــەماڵ وەرە ئــــەو کاغــــەزەم لــــە بــــۆ بــــەرە

بیــدە بــە دەســتی ئــەو دوڵــبەرە

□

ئەگەر بـە بـێ تـۆ خـاو خـۆراکم بـێ چاوێـشە مێمـان، دیـدەی راسـم بـێ

ئیشن لـەم خـوارە خولخولـەی رۆمـە خـوا خـەم نـەدا، مـن خـەمی تۆمـە

ئیـــشن لـــەو خـــوارە گوللـــە بارانـــە ئیجبـــاری کـــوردە و لـــە کرماشـــانە

ئاوەکەی ئەلوەن چۆن شـەتاو لێـڵەن چۆن هەوری بەهار لە گەشتو گێلـەن

سـەیی شالـی شـەل، مەلـای پاپالـە گـــشتی ئـــەنێرم بـــۆ تکـــا و لالـــە

□

باو ئەرای کەرەند جێی نەو نەمامان — نە وێنەی سەحنە، خۆشی بێ سامان
بۆ تۆ باری خەم نێشتگە وەلێوم — بۆچ ڕەحمێ ناکەی وەدڵەی پەشێوم
بە نووکی موژگان بیستوونم کەن — چەرخی زەمانە شیرینی لێم سەن
باوانت شێوێ بۆ مەستی چاوت — وەکۆسەی هەجیج، نەبردم ناوت
پراو بیستوون هەر دوو برابین — فەلەک کاری کرد لە یەک جیا بین
پام نا لە رکاو چوومە خوان زین — ولنگەیەک بکەم چ کەژ بیستین
تۆم سپاردە دەس هەناسەی سەردم — وەجۆش و خرۆش دڵەی پڕ دەردم
تاکەی وەک گوڵ هاونشین خاری؟ — تاکەی لە یار دوور، ڕەفێق ئەغیاری؟
تەنیا دارێک بیم، کەنێک لە پام بی — گل گل نازارەیل، دایم لە سام بی
ئێستە پیر بیمە بەڵگم رزیایە — گل گل نازارەیل، لە لێم تۆریایە
خۆم و دەماوەند شەرتێکمان کەردەن — ئەو تەم و من خەم، تاوەرۆی مەردەن
خۆزگەم وەخۆتان جێگە تان جەمە — هەژاری چوو من، لە لاتان کەمە
خوا مزانۆ من وەپات چوونم — سەد کوورەی ئاگر ها وە دەروونم
خالێ ها وەبان گۆنای راسەوە — بەرزنجە تێرێ وە مۆریاسەوە
خوای بانی سەر کەریم خانی لەک — مەعموورێ دەرکا بمان کانۆ یەک
جەم لە شیرازە و سورمە لەگۆی توور — میل لە سولەیمانی،کلدان لە مەخموور

ناردم بۆت بێنن لە وڵاتی دوور

جەوەڵجەوەڵ گەڵ وەکو رێ دیسان — جەوەڵ هەر مانگن ئێمە پیر بیمان
چوومە چەمبیستوون غەم بدەم بەرباد — دیم بە چاوی خۆم ڕەنجەکەی فەرهاد
چۆن شێویا لانەی دڵان پڕ داخان — جق جق سیا مای کۆپەی لەیلا خان
چاوت"قەدەم خێر" دوور بینی ئاڵمان — لە قەسر ئەیخەی ئەڕای کرماشان
چراغ تۆڕی یەکەی شەوەیلی تارم — تۆ تەخسیر نەیری خۆم سیا چارم
چاوەیلی چەقان پردەکەی کەولوش — کشتی وەفوروان خاڵەکەی پیرۆش

چاوەیلی مەستت بێ سورمە ڕەشن  هەر وەک هەسارە ڕووناک وگەشن
زولفان بە وێنەی زولفی نازداران  چنوور ئاوێزان لە بەر مەغاران
ڕەیحانە و ڕەیحانە، خۆشگڵ فراوانە  یە دووسێ دیرم، ماڵی یا لای بانە
ڕێگا کەم دوورە وام دە هەردەوە  ئەترسم بمرم بە ئەم دەردەوە

□

دوو چەو دێری چو پیالەی چینی  لە قەسرەوە خەی خانەقین وینی
دەمقەن و لوت قەن گشتی هەر قەنە  قەن فرۆش کەلەی قەنت وە چەنە؟
دەم گرد،مەم‌گرد،گشت گیانت‌گردەن  هیچ‌کەس‌وێنەی من پەی‌تۆ نەمەردەن
داڵکە پیرەکەم تەنیا من دارۆ  ئەگەر من نەوم، خوا ئاگر مارۆ
سەرم سپی کرد قامەتم چەمی  ئەویش لە داخی هاوچەشمان کەمی
سەرم چەرمگ وریشم تان و پۆ  تاکەی بنیشم وەسای قەولی تۆ
سەر وین کەچ کردی وەلای شەماڵدا  ماڵدار و بێ ماڵ گشت تەرکی ماڵدا
شەرت بۆ لە داخت هەرگیز نەخەنم  بەرگی ئازیەتی لە وەر نەکەنم
شەرت بۆ لە داخت هەر یەی حاڵم بۆ  بەرگی ئازیەتی ساڵە و ساڵم بۆ
شیەوان مخەفم بیرم وەڵاتەن  دڵەی کۆس کەفتەم هەر وەتەماتەن

□

عەشیرەت هۆ برایەل تیر بارانم کەن  وێڵێ باخوبەی نازارانم کەن
فرە حەز ئەکەم بە لەنجە و لاری  دێوانەمی کرد چاوەیل خوماری
نەنیشتم تاوێک من وە کەناری

فەقیانە چەرمگ فرشتەی شەوێ  شەوێ وەک ئیمشەو، قەت هەڵناکەوێ
قەسر و خانەقین بوونە یەخبەنان  بوونە قاتڵی توولە نەمامان
کۆهەکەی بیستوون ئەڕام چو خاکە  ئەڕای دووری تۆ، جەرگم چاک چاکە
کفتیە وەبەرمان، چەن‌کەش وچەن‌کۆ  مەگەر بای شەماڵ خەوەر با وەتۆ
گەردەن کەلەی قەن، لوت گوڵە باغی  چاوت قەدەم خێر، وەشایی یاغی

گەردەن موردای، کەنیل وەک بلوور
خۆ من حاکم نیم رات کێشم وە زوور

گەرمی و گەرمیان ساردی دەشتی وڕ
هات هاتی عێلی، گۆران و کەلوڕ

گل گل نازاران هاتن لە سەر دا
ئاگریان لە ماڵ جەسەی من بەردا

لە پاڵ کێف بێستوون دڵ دایم شادە
چونکە یادگاری شیرن و فەرهادە

ماڵمان ماڵاوسێ، چێخکمان بەینە
بۆچ من نەمزانی، بەم کەین و بەینە

مەواچە دوور من، دووری بێ مەیلەن
وەدووریت قەسەم دەروونم کەیلەن

ناڵەی‌دڵ فەرهاد، دەرهات لەبیستوون
سەدای ئەو ناڵە، منی کرد مەحزوون

نە شەو راحەتم، نە ڕۆژ دڵ شادم
یادی خەیاڵی، ناڕۆی لە یادم

وەتریفەی بڕنەو سنە چۆڵ ئەکەم
ئەی شەڕە لە بان باڵای تۆ ئەکەم

هەرماڵێ‌گیسکێ، خۆم بە تەنیا کۆڕێ
نەزری ئەڵڵا بێ، یارم نە تۆڕێ

یاران، هامسەران، ڕەفێقان، ئامان
زامانی سەختم نیەسی دەرمان

□

## گۆرانی فۆلکلۆری

بنووسن لە سەر کێلی مەزارم
شەهیدی عەشقم مەدەن ئازارم

بۆیە بەرانبەر ماڵتان دانیشم
کە تۆ دەرکەوی، ئاخێ هەڵکێشم

ئێواره بینیم لە ڕێگەی کانی
سێ جار سوجدەم برد بۆ چاوەکانی

ئەی خوا چەن خۆشە ماچی سەرەڕێ
دڵ لە ترس و لەرز، نەوایەکی بێ

ئەوا من ڕۆییم بە خوات ئەسپێرم
گەر پێم نەکرا بێم، دڵم ئەنێرم

ئەمرۆ لە کوێستان ئەبارێ تەرزە
ئاگری تێ بەردام، ئەو باڵا بەرزە

ئەگەر بمدەیتێ لەو دەمتە ماچێ
حەو پشت کافر، وە دۆزەخ ناچێ

سیگار مەکێشە دەمو تاڵ ئەبێ
دیانە تەڵاکەت لکەدار ئەبێ

ئێژن لەو خوارە مردو جەم بووە
قولف و کلیلکەی ئەو گوڵە گوم بووە

تو خوا مامۆستا جوانی بنووسە
بە نووسین نیە، بە چارە نووسە

هەر چەندە ئەکەم کارم نابێ ڕاس
نازانم دۆعای کام باوان سیاس

دەروێشی ناکەم، دەروێشی گرانە
ئەستێرەی ئاسمان جووت جووت ئەژمێرم
ئاە ونالەی من، کێو لە بێخ دێنێ
ئاگرت تێ بەردام، بۆ چی وەستاوی؟
ئاوەکەی زەلم ئەرژێتە سیروان
یا خوا هەر شەو بێ و ڕۆژ نەبێتەوە
ئەگەر ئەمزانی لە کوێ ئەکەی گەشت
مانگە شەو خۆشە مانگ لە سەر مالان
ئاگرم تێ بەر بوو، وەک پیرە دارێ
هەی داد و بێ داد، شین و زاریمە
خودا یەکێکە و پێغەمبەر هەزار
هەی ناکەم ناکەم، برا شوو ناکەم

دەروێشی لایەق، شای کەس نەزانە
گەر خودایش نەدا، شوکرانە بژێرم
ئاخۆ خواکەی من چیت بە سەر بێنێ؟
گەردەن بە وێنەی گەردنی مراوی
نەعلەت لەو باوکە، کچ نادا بە شوان
دەستم لە یەخەی یار نەبێتەوە
بە خۆلی ژێر پێت چاوانم ئەڕەشت
دۆستی جوانت بێ، دەم لە سەر خالان
ناکوژێمەوە مەگەر بەهارێ
لە دوای بالاکەت بێ قەراریمە
ئاسمان شەقی برد، تۆ کەوتویتە خوار
ئەو پیاوە پیرە، مێردی پێ ناکەم

□

ئەمڕۆ جەژنی شوانە
جا دەبێ لە مژدەی دا
بە بەفرەی و بە سەهۆلێ

مەڕ دێتەوە لە سەر کوێستان
ڕۆح دا بنێم لە سەر دەستان
بەردان دێنم بە کۆلێ

□

ددانێکت تێخست لە لای مووسایی
کووچەی کرماشان تەنگ وتاریکە
چۆمی وەلیخان نادا بوارم
ئەو نەم یار هەیە ناویان نازانم
خالێ ها وەبان گۆنای پیرۆزۆ

بۆ جاهێل کوشتن دەوری ئاوایی
بە یارێ دێرم کەمەر باریکە
بۆ سەقز دەچم بۆ خزمەت یارم
با تۆیشم ببێ، قەزات لە گیانم
هەر وەک چرایە بە نەکەڕۆزۆ

□

## لایە لایە

### لایە لایەی حەمە ئەمین بەگ(مینە جاف) بۆ حەسەنی کوڕی

هەی لایە لایە حەسەن لای لایە — لە خوام گەڕەکە بگەیتە پایە
پایە بلند بی، بەرز بێ مەقامت — بەوشەرت، سەربەرزی گەل بێ مەرامت
بۆیە من شیری سپیت پێ ئەدەم — بە خوێنی جگەر، پەروەردەت ئەکەم
سەرو گیان و ماڵ گشتی فیدا کەی — قەومت لە ژێری زیللەت ڕەهاکەی
ڕۆڵە بۆ پارە چاو لە خوار نەبی — قەت دوژمنی گەل بۆ ئەغیار نەبی
نەبیتە خادم فکری ئەجنەبی — قەومت نەفرۆشی بۆ سەر مەنسەبی
هەی لایە لایە حەسەن لای لایە — لەم گێژی غەمە، کەی دەرچوونیایە

□

### لایە لایە بۆ روناک

هەی لایە لایە روناک لای لایە — بە سۆزی دەروون بۆت ئەکەم لایە
کۆرپەی بچکۆلەم ڕۆڵەکەی دایە — هیوا دارم من، بتبێ دەسمایە
بەڵام نامەوێ پارە دارێ بی — هەژار نەناس و لە گەلت دوور بی
هەی لایە لایە کچم لای لایە — دەبا کوڕ وکچ وەک یەک بوونایە

□

### لایە لایەی حەلاوی ژنی بابا عەلی بۆ سالحی کوڕی

هی لایە لایە کۆرپەی نازارم — تۆ چۆنت زانی من دەردەدارم
هی لایە لایە لاوم لایە لایە — لە قورتی نەگبەت رزگار بوونیایە
لە گەڵ شیر بیخۆ، ئەم داستانە — وەک ماران گازە، ئێشی بێگانە
وە لایەی کوردی، لایەت بۆ ئەکەم — تا باش تێبگەی، وەک من تێ ئەگەم
هەر کەس بۆ قەومی ڕاستی لێ نایە — وەک کەشتی‌کون‌کا، خۆیشی تیاچوایە
هەی لایە لایە کۆرپەی رەنگینم — بۆ خزمەتی گەل خۆزگە بتبینم

□

## لایە لایەی فایق بێکەس بۆ شێرکۆی کوڕی

هــەی لایــە لایــە شــێرکۆ لای لایــە شــەوگار درەنگــە بــۆچ خــەوت نایــە

دنیــا کــش و مــات لــە هــەموو لایــە

گریــانی چیتــە، تــۆ چــی دەزانــی تــۆ تــازە غونچــەی بــاغی ژیــانی

تــۆم داوەتــە دەس، خــوا نگــەهبان ئێــشک گــری تــۆ، پــەری ئاسمانــان

ئەوەنــدە لــە خــوا ،تەمــەننا ئەکــەم وەتەن رزگار کەی لە ژێـر بـاری غـەم

□

## لایە لایەی قانع بۆ کوتەکی کوڕی

هــەی لایــە لایــە، ڕۆڵــە لای لایــە لــە کــزەی کــوردان، دەنگــم دەرنایــە

ڕۆڵــە ئــەو شــیرە، شــیرەی شــێرانە شــیری نعمــەتی، خــاکی کوردانــە

ڕۆڵــە بێــشکەکەت داری قەزوانــە نــەمامی بــاغی مەنــدەی بابانــە

بەنی دەسرازەت خوری شــەکی کــاڵ پەروەردەی کوێستان چەراگەی سەریاڵ

ئــاوی خواردنــەوەت کــانی جوانــە چێــشتت برنجــی دەشــتی مالوانــە

هــەی لایــە لایــە ڕۆڵــە لای لایــە خۆزگە تووی ئیفساق هــەرگیز نەبوایە

شــیرە راســتەکەم نــەخۆی بــە درۆ سەر سەری نــەبی نەمکــەی ڕەنجــەڕۆ

هــەی لایــە لایــە ڕۆڵــە لای لایــە میللــەتی جاهــل روو لــە بەڵــایە

گەر تۆ خــاین بــی، بــۆ ئـاو و خاکـت دەک ئەجــەڵ بگــرێ داوێـن و چاکـت

## سەرچاوەکان

١) توحفەی موزەفەرییە ئوسکارمان وەرگێراوی هێمن چاپەمەنی سەییدیان مەهاباد.
٢) کتێبی شاری وێران نووسراوی: عەلی حەسەنیانی(هاوار) چاپی ١٣٦٤ی هەتاوی
٣) قسە و باس لە گەڵ حاجی محەممەد خوداجو، بەیتی زەنبیل فرۆشی بۆ گێڕامەوە.
٤)گۆڤاری ئامانج ژمارەی ١٥ ساڵی ٢ خاکەلێوە و بانەمەڕی ساڵی ١٣٦٦ی هەتاوی
٥) ڕۆژنامەی سیروان ژمارەی ٢٩٥ ساڵی حەوتەم ١١ی ڕەزبەری ١٣٨٣ی هەتاوی
٦) گۆڤاری ئاوێنە ژمارەی ١٥ـ١٤ ساڵی ١٣٧٣ی هەتاوی
٧) گۆڤاری نویسا ژمارەی ١ بەهاری ١٣٨٣ی هەتاوی
٨) گۆڤاری ڕامان ژمارەی ٥٧ ٥ی ئازاری ٢٠٠١ی زایینی
٩) ئینترنت
١٠) گۆڤاری سروە ژمارەی ١٠ ساڵی سێهەم بانەمەڕی ١٣٦٦ی هەتاوی/ ژمارەی ٢٢ ساڵی ١٣٦٧ی هەتاوی/ ژمارەی ٣٩ ڕەزبەری ساڵی ١٣٦٨ی هەتاوی/ ژمارەی ٥٥ ڕێبەندانی ساڵی ١٣٦٩ی هەتاوی/ ژمارەی ٦٧ ڕێبەندانی ساڵی ١٣٧٠ی هەتاوی/ ژمارەی ٧٥ ساڵی هەشتەم ڕەزبەری ساڵی ١٣٧١ی هەتاوی/ ژمارەی ٩١ ساڵی نۆهەم ساڵی ١٣٧٢ی هەتاوی/ ژمارەی ٩٤ـ٩٣ ساڵی دووهەم خاکەلێوە و بانەمەڕی ساڵی ١٣٧٤ی هەتاوی/ ژمارەی ١١٩ ساڵی ١٣٧٥ی هەتاوی/ ژمارەی ١٢٨ـــ ١٢٧ ڕێبەندان ـ ڕەشەممەی ساڵی ١٣٧٥ی هەتاوی/ ژمارەی ١٦٤ / ژمارەی ١٦٨ ساڵی شانزدەهەم پووشپەڕی ١٣٧٩ی هەتاوی
١١) شریت، سی دی و گۆرانیەکانی کوردی

